## سەرچاوەكانی زانایی و نەزانی

لەوە دەترسم کە ناونیشانی وتارەکەم بۆ هزری رەخنەگرەکان هەژێنەر بێت. بەڕاستی ئەگەر "سەرچاوەكانی زانایی" (ناسین) گرفتێك دروست ناكات و لەمەڕ "سەرچاوەكانی هەڵە"ش هەروایە، ئەوا سەبارەت بە "سەرچاوەكانی نەزانی" مەسەلەكە تەواو بەشێوەیەكی دیكەیە" "نەزانی مەسەلەیەكی (سەلبیە): نەبوونی ناسینە، چۆن دەكرێ بۆ نەبوون، بە سەرچاوەیەك قایل بین[1].. كاتێك

[1] دیكارت و سپینۆزا لەوەش واوەتر چوون و پێیان لەسەر ئەوە داگرتووە كەنەك تەنیا نەزانی بەڵكو هەڵەش "جۆرێكە لەنەبوون"ی بێبەشییەك"ە لەناسین كەتەنانەت زیان بەبەكارهێنانی دروستی ئازادی دەگەێنی:



ناوونیشانی هەڵبژێراوی وتارەكەم بەیەكێك لەهاوڕێكانم وت، ئەویش هەر ئەم رەخنەیەی گرت. لەوەڵامی ئەودا بەپەلەو بی بیركردنەوە كارەكەی خۆم بەم شێوەیە پاساودا كەمەبەستێك لەپشت ئەم ناونیشانەوە هەیە، و بۆم روون كردەوە كەئەو مەبەستە، راكێشانی سەرنجی (بیسەران)ە بۆ لای هەنێك لەو رێبازە فەلسەفەییانەی كەهەرگیز قسەو باسێكیان لێوە ناكرێ، بۆ نمونە (جگە لەو رێبازەی كەلەسەر بنەمای تایبەتمەندی ئاشكرابوونی راستی"ە بەتایبەت تێڕوانینی پیلان بۆ نەزانیم[2] شیكردۆتەوە، كە نەزانیی نەك وەك نەبوونێكی سادەی زانایی بەڵكو وەك دروست كراو و سەریەكخراوی هێزە ترسناكەكان سەرچاوەی دەست

(CF. Descartes, Principes 1 re Partie, 33.42, ainsi que les troisieme et quatrieme Meiditations; sprinoza, ethique, deulxie’me partie, Prop.35et scolie, ainsi que Les Principes de Laphilosophie de Descartes, Premiere Partie, Prop. 15et scolie).

Methaphysiqe,- 1046 a 30-35, لەگەڵ ئەمەشدا وەك ئەرستۆ F. Par exemple, (سەرنجی داوەتە" هۆكار" یان هەڵە) 1052 aI

(Ethique deuxieme Partie, Prop. 41).

[2] conspiracy theory of ignorance.





تێوەردانە ناپاكو پیسەكان دەناسێ، كەدەروونمان پیسو ئالوودە دەكەنو بەشێوەیەكی روونو ئاشكرا ئێمە بۆ وەستانەوە لەبەرامبەر زانایيدا رادێنن.

ناكرێ بڵێم روونكردنەوەكانم گومانەكانی دۆستەكەمی رەواندەوە بەڵام بێدەنگی كرد. ئێوە (ئامادەبووان) بارودۆخێكی جیاوازتان هەیە چونكە بۆ رێزدانان بۆ ئەو رێسایانەی بەسەر ئەم كۆبوونەوەیەدا زاڵە بێدەنگی دەپارێزن. كەواتە دەبێ هیواداربم كەلەئێستادا وەك پێویست دردۆنگیەكانی ئێوەم نەهێشتوەو دەتوانم سەرەتای قسەكانم بۆ ئەو ناونیشانەی بەرامبەر، واتە بۆ بنەماكانی زانایی تەرخان كەم، نەك بنەماكانی نەزانی. هەڵبەت هەرخێرا باسی سەرچاوەكانی نەزانیو رێبازی داڕێژراو لەسەر بنەمای پیلان گێڕی لەدژی زانایش، دەكەم.

## (1)

ئەو مەسەلەیەی كەدەمەوێ دووبارە لەم ووتارەدا باسی كەم، نەك تەنیا بەو مەبەستەی كەسەرلەنوێ لێیبكۆڵمەوە بەڵكو بەو هیوایەی چارەسەری كەم، رەنگبێ تەنیا لایەنێك



بێت لەمشتو مڕی مێژوویی نێوان قوتابخانەی فەلسەفی بەریتانیو قوتابخانەی كیشوەری(قارەیی) ئەوروپا كەبریتییە لە: دژایەتی نێوان ئەزموونگەری كلاسیكی بیكۆن[1]، لاك[2]، باركلی[3] هیوم[4]، ستورات مێل[5] و عەقڵانییەتو هزرگەرایی كلاسیكی دیكارت[6]، سپینۆزا[7]، و لایبنێز[8] لەو رووبەڕووبوونەوەیەدا، قوتابخانەی بەریتانی پشتیوانی لەم روانگەیە دەكرد كەبنەمای سەرەكیی هەموو

---

[1] francis Beicon (1561–1626)، فەیلەسوفو نووسەری ئینگلیزی.

[2] John Lock (1632–1704)، فەیلەسوفی ئینگلیزی.

[3] George Berkeley (1707–1726)، فەیلەسوفی ئێرلەندی

[4] David Hume (1711–1776)، فەیلەسوفو مێژوونووسی ئینگلیزی.

[5] John stuart Mill (1806–1872)، فەیلەسوفو ئابووریناسی ئینگلیزی.

[6] Rene' Decartes (1596–1650)، فەیلەسوفو ماتماتیكناسی فەرەنسی.

[7] Baruch spinoza (1632–1677)، فەیلەسوفی هۆڵەندی.

[8] Gohtfried withelm Leibniz (1667)، فەیلەسووفو ماتماتیكناسی ئەڵمانی).





ناسینێك، دیتنە (سەیرکردنە)، لەکاتێکدا کەقوتابخانەی
کیشوەری لەو بڕوایەدا بوو کەروانگەی ئەقڵگەراییانەی
ئەندێشە رۆشن و دیارەکان، ئەم بنەمایە پێکدەهێنین.

زۆرێك لەومەسەلانەی لەم ڕوبەڕوبوونەوەیەدا جێگەی
باسن،هەنوکەش کاریگەری خۆیان هەرماوە. نەك تەنیا
ئەزموونگەری، کەئێستاش لەبەریتانیا فەلسفەی زاڵەو ولاّتە
یەکگرتووەکانیشی گرتۆتەوە، بەڵکو تەنانەت هەموو
ئەوروپاش ئیدی زۆرتر ئەم رێبازەیان وەك تیۆری
راستەقینەی ناسینی زانستیانە وەرگرتوە. بەداخەوە
هزرگەریی دیکارتی زۆرجار شکڵی گۆڕیوەو وەك یەکێك
لەجۆرە تازەکانی تیۆرە نائەقڵانیەکانی لێهاتوە.

لێرەدا هەوڵ دەدەم دەریخەم کەجیاوازیەکانی نێوان
قوتابخانەی ئەزموونگەرایی و هزرگەرایی، لەچاو ئەو
وێکچوونانەی لەنێوانیاندا دەبیندرێ، بایەخێکی کەمتریان
هەیە، و هەروەها دەمەوێ دەریخەم کە هەردووکیان
بەهەڵەداچوون. لەڕاستیدا ئەمە هەڵوێستی منە، هەرچەند بۆ
خۆم بەشێوەیەکی تایبەت ئەزموونگەراو هزرگەرام. بەبڕوای



من گەرچی بینین و هزر (عقل) هەر کامەیان دەبێ رۆڵێکی
گرنگ ببینن، بەڵام کارکردەکانیان جیاوازە لەو شتەی
کەناودارانی کلاسیکی ئەم قوتابخانانە دیارییان کردوە.
تێدەکۆشم هەتا بەتایبەتی ئەوە دەرخەم کەناتوانرێ نەهزرو
نەبینین هیچ کامیان، بەتەنیا، وەك ئەوەی تائێستا وتراوە،
بەسەرچاوەی ناسین بزانرێ.

## (2)

ئەم مەسەلەیە لەمەسەلەکانی ناسین یان ئەبستمۆلۆژی
واتە ئەو هەرێمەیە کەبەئەبستراکترین، ئاڵۆزترین و
بێبەرهەمترین فەلسەفەی رووت بەناوبانگە. بۆ وێنە هیوم،
کەلەمامۆستایانی ئەم بوارەیە، پێشبینی کردبوو کەبەهۆی
تایبەتمەندی ئەبستراکتیەت و لەهزر بەدەر بوون و بابەتی
نەبوونی ئاکامەکانی ئەبستمۆلۆژی، هیچ خوێنەرێك زیاد لە
کاتژمێرێك تەحەمولی ئەنجامگیریەکانی ناکات و
بایەخیشییان پێنادات.

کانت[1] بەجۆرێکی دیکە دەڕوانێتە مەسەلەکە. کانت لەو بڕوایەدابوو کەپرسیاری "دەتوانم چی بزانم؟" یەکێکە لەو سێ پرسیارە سەرەکییەی کەمرۆڤ توانیویەتی بیپرسێ. راسڵ[2] لەگەڵ ئەوەدا کەلەڕوی گیانی فەلسەفییەوە زۆرتر لەهیوومەوە نزیکە بەلاَم لەم بوارەدا لایەنگیری لەکانت کردوە. بەبڕوای من راسڵ راست دەکا، کەپێی وایە ئەپستمۆلۆژیا لەزانستەکانو ئاکارو تەنانەت لەسیاسەتدا، ئاکامگەلێکی پراکتیکی پڕ کاریگەری هەیە. راسڵ دەڵێ ڕێژەیی بوونی ئەبتسمۆلۆژی، یان ئەم روانگەیەی کەهیچ راستییەکی بابەتی بوونی نیە، ڕێك وەك کردار گەرایی (پراگماتیزم)ی ئەبستمۆلۆژیانە، واتە ئەم روانگەیەی کەڕاستی واتە بەسوودبوون، پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ

[1] iommanuel kant (1724–1804)، فەیلەسوفی ئەڵمانی.

[2] Bertrand Russell (1872–1970)، فەیلەسوف و ژیربێژ زانی ئینگلیزی.



دەسەلاَتخوازیی و چەمکەکانی پاوانخوازانە (توتالیتر)دا هەیە[3].

بێگومان بوچونەکانی راسڵ رووبەڕووی دژایەتی بۆتەوە. بەم دواییانە تاقمێك فەیلەسوف خەریکی لێکۆڵینەوەن لەمەسەلەی ناکارامەیی سەرجەمی فەلسەفە رەسەنەکان، هەربۆیە دەکرێ بڵێین، هەر ئەم حوکمەیان بۆ تیۆری ناسینیش دەرکردووە. لەروانگەی ئەواندا فەلسەفە، بەهۆی هەمان نێوەرۆکییەوە، ناتوانێ ئاکامگەلێکی گرنگی هەبێ، هەربۆیەش ناشێ کاریگەری لەسەر زانستەکانو سیاسەت دانێ. بەلاَم من لەو بڕوایەدام بیرۆکەکان مەترسیان هەیە، دەسەلاَتیان (توانایان) هەیەو جاری واش ڕووی داوە کەفەیلەسووفەکان، پێکهێنەری ئەمە بون. گەرچی گومان لەوەدا نیە کەراستیەکان هیچ ئیعتبارێکیان بۆ تیۆری نوێی ناکارامەبوونی بنچینەیی فەلسەفە نەهێشتۆتەوە.

لەڕاستیدا مەسەلەکە زۆر سادەیە. بیروڕا ئازادی خوازەکان ـ بڕوا بەشیاوی کۆمەڵگایەك لەسەر بنەمای ماف، دادپەروەری یەکسان بۆ هەمووان، مافە بنچینەییەکانو،

[3] cf B. Russell, Let the people Think, londres, watts, 1941, p. 77 sq.





بیری کۆمەڵگای ئازاد ـ دەتوانن بەبێ گرفت درێژەیان هەبێ ئەگەر ئەوە قبوولّ بکەین دادوەرەکان بێبەری نین لەهەڵەو ئەم مەترسیە لەئارادایە کەسەبارەت بە راستیەکان بەهەڵەدا بچن‌و قایلبین بەوەی کەلەلێکۆڵینەوەی دادوەریدا هەرگیز بەکردەوەو بەشێوەیەکی تەواو دادپەروەری رەها بەرێوەناچێ. بەڵام ئەو ئەبستمۆلۆژیایەی ئێمە پێی قایلین ئەوەمان فێردەکات کە ڕاستی بابەتی نەك تەنیا لەبوارێکی تایبەتدا،بەڵکو لە هەموو مەسەلەکاندا بوونی نیە و لەوباوەڕەدایە کە دادوەر ناتوانێ دەربارەی راستیەکان تووشی هەڵە بێت چونکە لەم بوارەدا هەروەك چۆن ناتوانی هەقی بێت، ناتوانێ هەڵەش بکات، لەم حاڵەتەدا ئیتر وەفادار بوونمان بەو بڕوایەی کە دەکرێ سیستمێك لەسەر بنەمای ماف‌و دادپەروەری‌و ئازادی بێتە ئاراوە مەیسەر نابێت.

## (3)

ئەو بزوتنەوە ڕزگاریخوازە گرنگەی کەلەگەڵ ڕێنسانس دا دەستی پێکردو بەتێپەڕین بەقۆناغەکانی چاکسازی (ڕیفۆرم)ی دینی، شەڕە ئاینیەکان‌و بەرخودانە



شۆڕشگێڕییەکان، بووە هۆی دروست بوونی کۆمەڵگا ئازادەکان، کەنەتەوە ئینگلیزی زمانەکان لەو ئیمتیازە بەهرەمەندن، بەتەواوی سەرچاوەیگرتووە لەگەشبینیەکی ئەبستمۆلۆژیانەی بێوێنە کەتێڕوانینێکی لەرادەبەدەر گەشبینانەیە بۆ لێهاتوویی مرۆڤ لەدیاریکردنی حەقیقەت و وەدەستهێنانی زانابیدا.

بنەمای ئەم تێڕوانینە گەشبینانە نوێیە لەمەڕ شیاوی زانایی، تیۆری تایبەتمەندی ئاشکرابوونی حەقیقەتە. دەشێ راستی شاراوە بێت بەڵام دەکرێ ئاشکرا بکرێ[1] ئەگەر خۆی دەرنەکەوێ ئێمە دەتوانین ئاشکرایکەین بێگومان

[1] بگەڕێنەوە بۆ ئەو گوتە هێنراوانەی کەلەسەرەتای کتێبەکەدا هاتوون:
spinoza, court traite, chap. xv (ou encors, Ethique, :deuxieme. Partie, scolie. de la prop. 43

"وەك چۆن ڕووناکی دەردەکەوێت ئاواش تاریکایی، وەك چۆن راستی رێچکەی تایبەت بەخۆی هەیە، خراپەیش هەیەتی""

De la Reforme de. L'entendement, 35,36; lettre ixxvi, 5ealinea in fine); Lock, De la conduite. De L'entendement, 3 (cf. Egalement Romains, I, 19).





پەردەهەڵماڵین لەسەر راستی کارێکی وا ئاسان نیە، بەڵام ئەوکاتەی کەڕاستی بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا دەرکەوت، ئێمە دەتوانین ببیینین و لەناڕاستی جیایکەینەوەو، بزانین لەڕاستیدا، (حەقیقەتە).

لەژێر ئالأی ئەم ئەبستمۆلۆژیا گەشبینانەیەدا،کە نوێنەرە سەرەکییەکانی بیکۆن و دیکارت بوون، زانست و تیکنۆلۆژیای تازە لەدایك بوو ئەم دوانە فێریان کردین کەهەرگیز بۆ سەرچاوەیەکی دەسەڵات (باڵادەست) لەبواری (حەقیقەت) دا جێگایەك نەبووە، چونکە سەرچاوەکانی ناسین (زانین) لەتاك تاکی ئێمە دایە: جا چ لەتوانای تێگەیشتنی ئێمەدا بێت کەبینینی ورد (دەقیق) ی سروشت مسۆگەر دەکات، چ لەبینین و ئاشکراکردنی زەین(زهن)ی ئێمەدا بێت کەبۆ جیاکردنەوەی راستی لەناراستی بەکاردێ، هەر بیرێکیش کەمێشك، زانیاریەکی روون و ئاشکرای لەسەری نەبێ، وەری‌ناگرێ.

مرۆڤ توانای ناسینی هەیە: کەواتە دەتوانێ ئازادبێ، ئەم فۆرمۆڵە دەربڕی ئەو پەیوەندییەیە کەگەشبینی ئەبستمۆلۆژیاو چەمکە ئازادیخوازاییەکان پێکەوە گرێ دەدا.



پێچەوانەی ئەم پەیوەندیەش هەیە. بێ متمانەیی بەتوانای هزر، بێ‌متمانەیی بەلێوەشاوەیی مرۆڤ لەجیاکردنەوەی حەقیقەت، تاڕادەیەك بەردەوام لەگەڵ بێ‌متمانەیی بەمرۆڤ ئاوێتەیە. بەم جۆرە بەدرێژایی مێژو گەشبینی ئەبستمۆلۆژیانە، هەمیشە لەتەك ئەو تیۆرەیەدا شەریك بووە کەسەرلێشێواوی مرۆڤ رادەگەیەنی و خوازیاری پێکهێنانی چەندین نەریتی بەهێزو پشتیوانیکردنی هێزێکی بەتوانایە کەبتوانێ مرۆڤ لەنەزانی و بێ‌ڕەوشتی رزگار بکات. (پاژی لێکۆڵیاری مەزن لەرۆمانی برایانی کارامازۆف لەنوسینی داستایوڤسکی بەشێوەیەکی بەرچاو ئەم تیۆرە دەسەڵاتخوازییە وێنا دەکاو ئەو بەرپرسیاریەی کەلەئەستۆی سەرچاوەکانی دەسەڵاتە، پیشان دەدات).

بێگومان لەبناغەوە لەنێوان رەشبینی و گەشبینی ئەبستمۆلۆژیانەدا هەمان ئەو جیاوازیە هەیە کە لەبواری تیۆری ناسیندا نەریتخوازی و هزرگەرایی لەیەکتر جیادەکاتەوە. (من، ئەم زاراوەیەی دوایی - واتە هزرگەرایی - بەواتایەکی بەربڵاوتر بەکاری دەهێنم، کەخاڵی بەرامبەری ناهزرگەراییەو، هەردوو هزرگەرایی دیکارتی و





ئەزمونگەرایی، لەخۆدەگرێ) لەڕاستیدا دەکرێ نەریتخوازی بەو ئەندێشەیە بزانین کەلەنەبوونی راستیەکی بابەتی کە لەناراستی جیابکرێتەوە،و دەبێ لەنێوان ئەم دوو حاڵەتە واتە قبوولّ کردنی باڵادەستی نەریت یان تەحەمولی ئالۆزیو پشێوی یەکێکیان هەڵبژێرین، لەکاتێکدا بەدڵنیایەوە هەمیشە هزرگەرایی خوازیاری ئەوەبووە زانستی ئەزمونیو هزر مافی رەخنەگرتنو قبوولّ نەکردنی نەریتەکانو سەرچاوەکانی دەسەلاّتداریان هەبێ چونکە ئەوانە (نەریتەکانو سەرچاوەکانی دەسەلاّتداری) لەنەزانیەکی سادەو رووت، پێش داوەریەکان یان رێکەوتو رووداوەکان، سەرچاوە دەگرن.

## (4)

داخۆ بواریکی تا ئەو رادەیە ئەبستراکتی، وەك ئەبستمۆلۆژیەکی بێخەوش کە هێندە بێخەوش نەبێت وەك بیری لێدەکرێتەوە (و ئەرەستۆ بەم جۆرە بیری دەکردەوە) و بەپێچەوانەوە، ئەنگیزە و سەرچاوەی نەستیی ئەو



ئەندێشانەی کە رایدەگەیەنێت،تارادەیەکی زۆر ئاواتە سیاسی و مەیلە دلخوازەکان بێت،کێشە دروستدەکات و،دەبێ ئاگادارکردنەوەیەك بێت بۆ ئەبستمۆلۆژیمان. ئەو لەم پەیوەندییەدا دەتوانێ چی بکات؟ من خۆم وەك ئەبستمۆلۆژیست تەنیا خولیایەکم هەیە ئەویش: دۆزینەوەی راستی‌یە لەو مەسەلانەدا کەئەبستمۆلۆژیا دەیانهێنێتە گۆڕێو هاتنەوەو یان نەهاتنەوەی ئەو راستیە لەگەڵ بیرە سیاسیەکانی مندا. بەلاّم ئایا ئەو مەترسیە لەئارادا نیە کەچاوەڕوانیەکانو روانگە سیاسیەکان، بێ ئەوەی ئاگام لێبێت کارم تێبکەن؟

ئاشکرایە من، تەنیا ئەزموونگەراو ئەقڵگەرایەکی تایبەت نیم بەڵکو لەهەمان کاتدا لیبرالّ (بەواتا ئینگلیزیەکەی)یشم. بەلاّم رێك لەبەرئەوەی لیبرالّم وا بیردەکەمەوە کەکەمتر شتێك بۆ لیبرالّێك لەوە گرنگترە کەروانگە جۆراوجۆرەکانی سەرچاوە گرتوو لەبیری لیبرالّی بخاتە ژێر تاقیکردنەوەیەکی رەخنەگرانەی قوولّ.





من بەئەنجامدانی تاقیکردنەوەیەکی لەم چەشنە، ڕۆڵی بڕێك لەتیۆرە ئەبستمۆلۆژیەکان لەپەرەسەندنی ئەندێشەی لیبراڵ و، بەتایبەت شێوازە جۆراوجۆرەکانی دەرکەوتنی گەشبینی ئەبستمۆلۆژیانەم ئاشکرا کرد. پێویست بوو وەك ئەبستمۆلۆژیستێ ئەوە قبوڵ بکەم کە ئەو تیۆرانە بەپەسەند نەزانم و ڕەتبانبکەمەوە. ئەم ئەزمونە دەتوانێ دەریبخات کەخولیاکان و چاوەڕوانیەکانی ئێمە وەك پێویست ئاشکراکەری ئەو ئاکامانە نین کەدروستیان دەکەین، باشترین شێواز بۆ گەڕان بەدوای ڕاستیدا ڕەنگە ئەوە بێت کەبەر لەهەموو شتێك ئازیزترین بیروڕاکانی خۆمان بدەینە بەر ڕەخنە. پێدەچێ کەسانێك ئەم گەڵاڵەیە بەشتێکی فێلاوی بزانن. بەڵام بۆ ئەو کەسانەی کەخوازیاری دۆزینەوەی ڕاستین و باکیان لێی نیە، بەو شێوە نابێت.



## (5)

تاقیکردنەوەی ناوەڕۆکی ئەبستمۆلۆژیای گەشبینانەی بڕێك لەبیرو هزرە لیبراڵیەکان کۆمەڵێك تیۆری بۆ ئاشکرا کردم کە ئەگەرچی زۆرتر بەشێوەی پاڵەکی وەرگیراوە بەڵام، ئەوەندەی من بزانم هیچکات ڕاشکاوانە نەدراوەتە بەر باس و لێکۆڵینەوەو، تەنانەت فەیلەسووفەکان یان مێژووناسانیش سەرنجیان نەداوەتێ. سەرەکیترینی ئەم تیۆرانە، هەمان تیۆری تایبەتمەندی ڕۆشنی حەقیقەتە کەپێشتر باسمان لێوەکردو، سەیرترینیان، کەلەپەرەسەندنی سەرسووڕهێنەرانەی یەکەمیان سەرچاوەی گرتووە تیۆری پیلان بۆ نەزانیە.

مەبەستم لەتایبەتمەندی ڕۆشنی حەقیقەت، وەك دەزانن، ئەم تێگەیشتنە گەشبینانەیە کەهەرکات ڕاستی بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا، دەرکەوێ دەتوانرێ وەك حەقیقەت، بناسرێ. بەم پێیە ئەگەر ڕاستی لەخۆیەوە ئاشکرا نەبێ ئەوەندە بەسە کە ئێمە ئاشکرای بکەین، لەوە بەدوا بوار بۆ هیچ قسەو باسێك نامێنێتەوە. چاو بۆ بینینی





راستی (ڕۆشنایی سروشتی) هێزیش بۆ توێژینەوەی راستی بەئێمە دراوە.

ئەم تیۆرە بنەمای وانەکانی دیکارت و بیکۆنە، گەشبینی ئەبستمۆلۆژیانەی دیکارت لەسەر بنەمای تیۆری حەقیقەتی خوایی[1]، کەبنەمای سەرەکییەتی، دامەزراوە: ئەوەی کەئێمە بەڕوونی و ئاشکراییەکی راستیەوە تێیدەگەین بێگومان دەبێ حەقیقەتی هەبێ چونکە ئەگەر بەپێچەوانەی ئەمەوە بێت ئەوا خوا ئێمەی فریوداوە. بەم پێیە ئەوە حەقیقەتی خواییەکە دەبێتە هۆی ئاشکرابوونی راستی.

بیکۆنیش تیۆرێکی لەوشێوەیەی هەیە" کە ئەویش تیۆری حەقیقەتی سروشتیە[2]. سروشت، کتێبێکی کراوەیە هەر کەسێك بەبیرێکی پاکەوە بیخوێنێتەوە توشی هەڵە نابێت و تەنیا ئەوکاتە هەڵە دەکات کەمێشکی ئاخنرابێت بەحوکمە پێشوەخت دراوەکانەوە.

1 veracitas dei
2 veracitas



ئەو مەسەلەیەی دوایی دەریدەخا کەتایبەتمەندی ڕۆشنی حەقیقەت لەپێویستی سەرنجدان لە هەڵەدا خۆی دەبینێتەوە. ناسین، واتە هەبوونی حەقیقەت پێویستی بەڕوونکردنەوە نیە. بەڵام ئەی چۆنە لەگەڵ ئاشکرابوونی راستیشدا مرۆڤ تووشی هەڵە دەبێت؟ دەبێ بەدوای هۆکاری ئەم مەسەلەیە لەتاوانی خۆ بەدورگرتنمان لەبینینی راستی ڕووندا بگەڕێین، یان لەحوکمدانە پێشوەختەکاندا کە فێرکاریەکان و نەریتەکان، لەمێشکی ئێمەدا چاندوویانە. رەنگە نەزانی کاری ئەو هێزانە بێت کە پیلانیان دارشتوە بۆ راگرتنی ئێمە لەنەزانیدا و، بۆگەن کردنی مێشکمان بەهۆی چەپاندنی ناڕاستی لەناویداو، هەروەها بۆ کوێرکردنی ئێمە لەئاست حەقیقەتی ڕووندا. کەواتە ئەم حوکمدانە پێشوەختانەو هێزە نەیارەکانی ئێمە سەرچاوەکانی نەزانین.

خوێندنەوەی مارکسیانەی تیۆری پیلان بۆ نەزانی زۆر ناسراوە: ئەویش پیلانەکانی بڵاوکراوە سەرمایەداریەکانن کەحەقیقەت ئاوەژوو دەکەنەوەو هەڵاوێردی دەکەن هەتا ئایدۆلۆژیای ناڕاست لەمێشکی کرێکاراندا جێ‌بخەن.





**بێگومـــان بـــەگوێرەی ئـــەم تیـــۆرە لـــەنێو ئایـــدۆلۆژیا ناڕاستەکاندا، ڕێبازە ئاینییەکان شوێنێکی بەرچاویان هەیە. سـەیر ئەوەیـە کەتێدەگـەین ئـەم تیـۆرە چـەند بـێ بناغەیـە. سیمای قەشەی فێڵبازو گومڕا، کەخەڵك لەنەزانیدا ڕادەگرێ نموونەیـەکی بەرچـاوی سـەدەی هەژدەیـە، ئەگـەر هەڵـەش نەکەم، یـەکێك لەناونیشانەکانی بیری لیبراڵی بوو. بنـەمای ئەم سیمایە، شێوە بیرکردنـەوەی ئاینی پرۆتستانی لەسـەر فێڵەبازییـــەکانی کلێســـای کاســـۆلیکی و، هـــەروەها لەئەندێشـــەکانی ئـــەو مولحیدانـــەدا بـــوو کەروانگەیـــەکی لەوشێوەیان لەمەڕ کلێسای ئینگلیزی (ئینگلیکن)[3] هەبوو[4].**

[3] ئینگلیکن (ئینگلیکانیزم) کلێسای یاسایی ئینگلیزە کەدوا بەدوای پچڕانی پەیوەندی نێوان هەنریی هەشتەم لەگەڵ کلێسای ڕۆمادا (1534) دامەزراو پاشای ئەو وڵاتە وەك پێشەواکەی ناسرا. ئەم ڕێبازە نەریت و دەستووری تایبەت بەخۆی هەیە.. وەرگێڕی فارسی.

[4] من لەشوێنێکی دیکەدا وتوومە کەدەکرێ ڕەچەڵەکناسیی ئەم سیمایە هەتا لای کرینیاس، مامی ئەفلاتۆن بەرزبکرێتەوە.

CF. The open society and its Enemies, Londres Routledge, 1945 (1966), chepitre 8, section II.



**بڕوایـــەکی ئـــاوا ســـەیر بـــەبوونی فێـــڵ و تەڵەکەیـــەك، تاڕادەیـــەك دەرئـــەنجامی ناچـــاری بیرکردنەوەیـــەکی گەشبینانەیە لەسەر بنەمای ئەم لافلێدانە کەئەگەر بوارێکی لـــەبار بـــۆ حەقیقـــەت بڕەخســـێ حـــەق و، بـــەپێڕەوی لـەو(حەقیقـەت)، چـاکە؛ سـەردەکەوێ. " باحـەق و ناحـەق (ڕاسـت و ناڕاسـت) ڕووبـەڕوو ببنـەوە؛ ئایـا قـەت بینـراوە کەحەقیقەت لەڕووبەڕووبوونەوەیەکی تەواو دادپەروەرانـەدا، ژێر بکەوێ؟[5]" بەگوێرەی ئەمە هەرکات حەقیقەتی میلتۆنی[6] شکستی خوارد بەناچار دەبێ بڵێین مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو حەقیقەتـەدا نـاڕەواو بـێ بەزییانـە بـووە: کەواتـە ئەگـەر حەقیقـەت کـەروون و ئاشـکرایە بـراوە نـەبێ، ڕۆشـنە کـەهێزە**

[5] j. Milton, pour La liberte de la presse sans autorisation ni censure. Areopagitica, paris, Aubier. Flammarion, 1969.p.271 (traduction modifiee).

ئەمە ئەو پەندە فەرەنسیەمان بیرد ەهێنێتەوە کەدەڵێ: "حەقیقەت هەمیشە سەردەکەوێ".

[6] دراوەتـە پـاڵ جـۆن میلتـۆن (John milton) (1608–1674)، شـاعیری ئینگلیزی کە شیعری فەیلەسووفانەو ڕۆمانی دەهۆنیەوە.(وەرگێڕی فارسی).





چەپەڵەكان پاشەكشەیان پێكردوە. بەم پێیە ئاشكرایە كاتێك كەنەرمو نیانی لەباوەڕێكی گەشبینانە بەسەركەوتنی حەقیقەتەوە سەرچاوەی گرتبێ بنەمایەكی پتەوی نیە. و دەتوانێ ببێتە تیۆری پیلان، كەئەستەمە لەگەڵ نەرمو نیانیدا بێتەوە.

من لافی ئەوە لێنادەم كەتیۆری پیلانرێژی قەت هەڵگری كەمەكێك لەراستی نەبووە، بەڵام لەو بڕوایەدام كەبەشی زۆری ئەو تیۆرە ئەفسانەیەو، تیۆری تایبەتمەندی رۆشنی حەقیقەتیش كەسەرچاوەی تیۆری پیلان ڕێژییە وەها رەوشێكی هەیە.

لەڕاستیدا حەقیقەت وا بەئاسانی بەدەست نایەت، تەنانەت دوای ئەوەی كە بەدەستیش هات دەتوانێ بەئاسانی لەكیس بچێ. هەندێك جار، جا فرتو فێڵ لەئارادا بێت، یان نەبێت، بیروبڕوا ناڕاستەكان، دەتوانن بەبێ سەرنجدان لەتەواوی ئاكامە ئەزموونیەكان، بەشێوەیەكی سەرسووڕهێنەرانە، چەندین سەدە بەردەوام بن. مێژووی زانستەكان، بەتایبەت زانستی پزیشكی پڕە لەنموونەی



بەرچاوی لەوجۆرەو، بەشێوەیەكی گشتی تیۆری پیلان خۆی دەرخەری ئەوە. مەبەستم ئەندێشەیەكی هەڵەیە كەبەپێی ئەو تەواوی رووداوە خراپەكان، لەئیرادەی نەگبەتی هێزێكی چەپەڵەوە سەرچاوەی گرتووە. جۆرە جیاوازەكانی ئەم شێوە بیركردنەوەیە توانیویەتی تا ئیمرۆش درێژە بەمانەوەی خۆی بدات.

بەمجۆرە ئەبستمۆلۆژیای گەشبینانەی بیكۆنو دیكارت ناتوانێت راست بێت. بەڵام ئەوەی كەلەمێژوی ئەم ئەندێشەیەدا سەرسوڕهێنەرە ئەوەیە كەبێگومان ئەم ئەبستمۆلۆژیا ناراستە، سەرچاوەی سەرەكی شۆڕشێكی هزریو ئاكاری بێوێنە بوو. ئەم شێوە بیركردنەوەیە مرۆڤەكانی هاندا خۆیان بیربكەنەوە، بەوە هیواداری كردن كەدەتوانن بەیارمەتی زانایی، خۆیانو خەڵكیتر لەدیلیەتیو هەژاری رزگار بكەن، هەر ئەم ئەندێشەیە بوو كەبناغەی زانستە نوێیەكانی دامەزراند، بووە هاندەری خەبات لەدژی پشكنین (سانسۆر) و سەركوتكردنی ئازادیی بیروباوەڕ، بنەمای خود هۆشیاری جیاواز لەگەڵ كۆمەڵو

تاك گەرایی بوو، هەروەها نێوەڕۆكێكی تازەی بەپلەو پایەی (كەسایەتی) مرۆڤ بەخشی. لەم ئەندێشەیەوە ویستی رۆشنگەرییە جیهانییەكانو مەیلی نوی بەرەو كۆمەڵگای ئازاد، هاتە ئاراوەو لەدایك بوو. ئەم ئەندێشەیە بووە هۆی ئەوەی كەمرۆڤەكان لەئاست خۆیانو كەسانیتردا هەست بەبەرپرسیاریەتی بكەن، نەك هەر ویستو ئیرادەی چاككردنی چارەنووسی خۆیان بەڵكو ویستی باشكردنی چارەنووسی رەگەزی مرۆڤیشی تیا پێكهێنان، و ئەمە جۆرێكە لەو ئەندێشانەی كەخۆی لەكەموكوڕیی بێبەری نیە بەڵام چەندین ئەندێشەی رەوا لەوانەوە هاتۆتە ئاراوە.

## (6)

بەڵام ئەم ئەبستمۆلۆژیا ناڕاستە چەندین ئاكامی ترسناكیشی هەبووە. ئەو روانگەیەی كەتایبەتمەندی رۆشنی حەقیقەت قبولْ دەكات ـ بۆ هەموو كەسێكی بەڕوون دەزانێ، بەو مەرجەی كەسەكە خۆی بیەوێ ـ تارادەیەك بناغەیەكە بۆ تەواوی جۆرەكانی دەمارگیری، چونكە بەو



پێیە تەنیا خراپەزۆرچەپەڵەكان دەتوانن هاندەری ئەوەبن كەمرۆڤ نەیەوێ حەقیقەتی رۆشن ببینێ، تەنیا ئەو كەسانەی لەحەقیقەت دەترسن پیلان دەگێڕن تا حەقیقەت دەرنەكەوێ.

ئەم تیۆرە، جیا لەدروستكردنی مرۆڤە دەمارگیرەكان كارێكی دیكە ئەنجام نادات ــ ئەو مرۆڤانەی كە لەو بڕوایەدان هەركەسێك ئەو حەقیقەتە روونە نەبینێ بەدڵنیایەوە یەخسیری شەیتانە ــ و هەروەها دەتوانێ بەدەسەڵاتخوازی كۆتایی بێت، هەرچەندە بەشێوەگەلێك ئەم رۆڵە دەگێڕێ كەوەك شێوازەكانی ئەبستمۆلۆژیای ڕەشبینانە، راستەوخۆ نیە، بۆیە كار بەو جێیە دەگات، كەلەڕاستیدا حەقیقەت روون نیەو، حەقیقەتێك كەلافی ئەوە لێدەدرێ رۆشنە، پێویستی بەوەیە كەبەردەوام بەیارمە تی جۆرە لێكدانەوەیەك، بەرهەم بێتو جەختی لێبكریو ئەم كاری بەرهەم هاتووەو جەخت لێكردنەش بەردەوام دووپات ببێتەوە. سەرچاوەیەكی دەسەڵاتیش پێویستە هەتا ئەو شتەی كەدەبێ وەك حەقیقەت بناسرێ بەشێوەیەكی





رێکوپێك دەرخواردی بداو سەقامگیری بکات. بەڵام رەنگە ئەم سەرچاوەیە بگاتە ئەوجێیەی کەئەو ئەرکە سەرەڕۆیانەو ملهوڕانە بەڕێوەبەرێ. لێرەدایە کەزۆرێك لەئەبستمۆلۆژیستەکان تووشی نائومێدی دەبن، دەست لە گەشبینیەکانی پێشوویان هەڵدەگرن و تیۆری دەسەڵاتخوازانەی لەڕادەبەدەر دائەتاشن کەلەئەبستمۆلۆژیای ڕەشبینانەوە ئیلهام وەردەگرێ. بەبڕوای من، ئەفلاتون لەدیارترینی ئەو کەسانەیە و بەرجەستەکەری گۆڕینێکی غەمگینانەی ئاواهییە.

## (7)

قوتابخانەی ئەفلاتون، لەسەردەمی بەر لەتیۆری حەقیقەتی خودایی دیکارت، کەبەپێی ئەو تیۆرە بینینی ئەقڵانی، مرۆڤ فریو نادات، چونکە خوا حەقیقەتەو ناتوانێ هەڵمانخەڵەتێنێ،و ڕۆڵێکی یەك لاکەرەوی گێڕاوە. بەدەربڕینێکیتر تێگەیشتنی مرۆڤ سەرچاوەی (زانین)ە، چونکە خوا سەرچاوەی (زانین)ە. ئەم تیۆرە مێژوویەکی دێرینی هەیەو بەئاسانی مێژووەکەی بۆ هۆمێر[1] و هێسیود[2] دەگەڕێتەوە.

لامان ئاسایی بوو، گەر سەرچاوەکانی ئەم تیۆرەمان لای زانستخوازان و مێژووناسان بدۆزیایەتەوە، بێگومان بڕێك تووشی سەرسوڕمان ئەبین کەدەبینین شاعیران، دامەزرێنەرانی ئەو تیۆرەن، شاعیرە یۆنانیەکان سەرچاوەکانی زانایی خۆیان دەگواستەوە. ئەم سەرچاوانە، سروشتێکی خواییان هەیەو هەمان مۆسەکانن[3]. گیلبێرت مۆرای[4] دەڵێ: "شاعیرە حەماسیەکانی یۆنان نەك تەنیا ئەو شتەی ئێمە پێی دەڵێین ئیلهام بەڵکوو تەنانەت زانیاریەکانی خۆیان لەسەر ڕووداوەکانیش لەمۆسەکان وەردەگرن. مۆسەکان هەن و لەهەموو شتێك ئاگادارن" (.. ) هسیود (..)

---

1 Homere (سەدەی نۆی پێش زایین؟)، شاعیری داستانیی یۆنان..

2 He'siode (سەدەی هەشتی پێش زایین)، شاعیرێکی یۆنانی.

3 Muses، نۆ ژنە خواوەندەکەی هونەرو ئەدەبیاتی یۆنان.

4 Gilbert Murray (1866–1957) شاعیرێکی بەریتانی.







بەردەوام دەڵێ زانایی خۆی بەقەرزاریاری مۆسەکان دەزانێ، هەڵبەت پێی وایە سەرچاوەی دیکەش بۆ زانایی هەیە (..) بەلاّم زۆرتر لەگەڵ مۆسەکاندا راوێژ دەکات (..) و هۆمێریش، کاتێك بۆ نمونە قسە لەرێکخستنی سوپای گەلە سەرەتاییەکانییۆنانیەکان دەکات هەر ئەم کارە دەکات"[5].

هەروەك لەم دەقەدا دەردەکەوێ، شاعیرەکان بەپێی خوو و نەریت نەك تەنیا شانازی بەخواکانی سەرچاوەی ئیلهامی خۆیانەوە دەکەن، بەڵکوو تەنانەت شانازی بەخواکانی سەرچاوەی زاناییەکانی خۆشیانەوە دەکەن، ئەو خواوەندانەی کەمسۆگەرکەری راست دەرچوونی چیرۆکانیان بوون.

لای هیراکلیت[6] و پارامینیدسی[7] فەیلەسووفیش ئەم سەرچاوانە دەبینینەوە. بەرواڵەت هێراکلیت خۆی وەك

---

[5]. G. Murray, The Rise of the Greek Epic, oxford, clarendon Press, 1924. P .96

[6] Heraclite(550 تا 480 پێش لە دایك بوون), فەیلەسوفی یۆنانی وەرگێری فارسی

[7] Parmenide(515–440 پ. ز) فەیلەسوفی یۆنانی– ەرگێڕیی فارسی



پێغەمبەرێك دەناسێنێ کە "لەزمانی ون بوو و دەستەمۆ کراوی خواوەندەوە قسە دەکات"، خواوەندێك کەهەمان زیۆسی[8], سەرچاوەی تەواوی زاناییەکانە.[9] بەلاّم دەکرێ پارمێندیس بەئەڵقەی پەیوەندی ئەو زنجیرەیە بزانین کەهومێرو هێسیود بەدیکارتەوە دەبەستێتەوە. ئەستێرەی رێپیشاندەرو ئیلهام بەخشی پارامیندس[10] ئەو ژنە خواوەندەیە کەهیراکلیت بە پاسەوانی حەقیقەتی دەزانێ، پارامینیدس ئەو ژنە خواوەندە، بە پاسەوانو دەرگەوانی حەقیقەتو سەرچاوەی تەواوی زاناییەکانی دەزانێ. بەلاّم لەنێوان پارامیندیسو دیکارتدا جیا لەتیۆری سادەی حەقیقەتی خوایی لایەنی هاوبەشی زۆرتر هەیە. لەراستیدا خواوەندی پارێزەری حەقیقەت بەپارامیندیس دەڵێ بۆ

---

[8] . Zeus.

[9] . H. Dicls et W. kranz. Die Fragmente der vorsokratiker, Berlin, Weidmann. 1951-1952, DKB 92,32; cf. 93, 41, 46, 50.

[10] . Dike





جیاکردنەوەی هەق لەناهەق دەبێ تەنیا متمانە بەلۆگۆس[11] (ژیربیژیی، منتق) بکات، نەك بەهەستی بینین یان بیستن یان چێشتنی خۆی[12]. تەنانەت بنەمای تیۆری فیزیایی (سروشتی) پارامینـدیس کـەوەك دیكـارت لەسـەر بنـەمای تێگەیشتنی ئەقڵانی زانایی (ناسین) دایدەمەزرێنێ لەتیۆری فیزیای دیکارت، واتە نەشیاویی بەتاڵ بوونی (بۆشایی) جیهان و پێویستی پڕبوونی ئەو (پڕیە)، دەچێ.

ئـەفلاتوون لـەكتێبی یـۆن[13]دا بەشـێوەیەكی زۆر رۆشـن، ئیلهامی ئیلاهی شاعیر ـ دەستەمۆبوونی خوایی شاعیر ـ و سەرچـاوەكانی زانـایی راسـتین لەیـەكتر بـەجیا دەزانـێ[14].

---

[11] . logos وشەیەكی یۆنانیە كەلەسەردەمی كۆندا بەواتای ئەقڵانیەت یان هزرێکـی مـەزن دەهـات كەبەسـەر جیهانـدا زاڵ بـووە، ئـەمڕۆ واتـا یـەكیتر دەگەیەنێ. م فارسی.

[12] . 126 CF. Ibid, Heraclite, B54, 123, 88et, ئەو ئاماژە دەكات بەو ئاڵوگۆڕە نادیارانەی كەدژە دیارەكان پێكدەهێنن.

[13] . Ion

[14] ئـەم بابەتـە لـەكتێبی فیدرسـدا بەتایبـەت لـەژمارەی e259 بـەدواوە بەڕوونكردنەوەیـەكی زۆرتـرەوە باسـی لێوەكراوەتـەوە" لەهـەمان حاڵـدا وەك ئـەوەی كەچـێرنیس پێـی وتم ئـەفلاتوون لـەژمارەی 275ی هـەمان كتێبـدا



ئـەفلاتوون بەوەقایلـدەبێ كەئیلـهام بەشـاعیران دەدەرێ بـەڵام نكـۆڵی لەهەرچەشـنە سەرچـاوەیەكی بـاڵا دەسـتی خـوایی لـەزانایی یـان زانینـی راسـتیەكان دەكـات كەشـاعیرەكان، ئەوەش بەئیمتیازێك بۆ خۆیان دادەنێن.

لەگـەڵ ئەمەشـدا بـیری سەرچـاوەی خـوایی زانـایی لـەتیۆری بـەناوبانگی یـادەوەریی ئەفلاتونـدا، كەلەچـەند روویەكـەوە بـۆ هـەموو كـەس زەمانـەت كـاری بـوونی سەرچـاوەی خـوایی ناسـینە (لێـرەدا مەبەسـت، ناسـینی ناوەڕۆك یان ماكی هەرشتێكە نەك زانینی رووداوە مێژوویە تەواو دیارەكان) شوێنێكی سەرەكی هەیە، بەگوێرەی كتێبی مێنـون[15] هـیچ شـتێك نـەماوە كـەگیانی نـەمری مرۆڤ، بـەر لـە لـەدایك بـون فێـری نـەبووبێ. لەئەنجامـدا، لەبەرئـەوەی سـەرجەمی ئەندێشـەكان خزمـی یـەكترن كەواتـە دەبێ گیـانی ئێمـە خوشـكیان بێـت، هەربۆیـە هـەموویان دەناسـێ: هـەموو

---

راشكاوانە جیاوازی دادەنێ لەنێوان مەسەلەكانی پەیوەندیدار بەسەرچاوەی ناسین و ئەو مەسەلانەی پەیوەندیان بەحەقیقەتەوە هەیە.

[15] . Menon





شتێك دەزانێ[16]. لەكاتی لەدایك بووندا ئێمە هەموویان لەبیر دەكەین بەڵام لانی كەم دەتوانین بەشێك لەوان وەبیربێنینەوەو سەرلەنوێ زانایی خۆمان دەستكەوێتەوە:

بەس ئەوەندەی سەرلەنوێ حەقیقەت ببینین دەیناسینەوە. كەواتە هەر تێگەیشتنێك، سەرلەنوێ ناسینەوەیەكە، و بیرهێنانەوەو تازەكردنەوەی بیرەوەری ناوەڕۆك یان ماكی راستین كە پێشتر ناسیبوومان[17].

ئەم تیۆرە وای دادەنێ كەگیانی مرۆڤ، تائەوكاتەی كەلەگەڵ جیهانی نەمری ئایدیا، ناوەڕۆكەكان یان زاتە راستینەكاندا لەپەیوەندیدا بێت، حاڵەتێكی هەموو شت زانی خوایی هەیە. لەدایك بوونی مرۆڤ دابەزینێكە، دابەزین لەحاڵەتی سروشتی یا خوایی زانینە و هەربۆیە سەرچاوەو هۆكاری نەزانی مرۆڤ لێرەدایە (تۆوی ئەم ئەندێشەیە

---

[16] لەمەڕ پەیوەندی خزمایەتی و ناسینیش ئەم سێ بەرهەمەی ئەفلاتوون (فێدۆن، كۆمار، یاساكان) بخوێننەوە.
.Phedon79d, Republique 611 d et Lois 899 d

[17] . CF. Phedon, 77e sq, 75 e



كەنەزانی تاوانێكە، یان لانی كەم پەیوەندی بەتاوانەوە هەیە لەمەدا دەبینین، كتێبی فیدرس، ژمارە 765 بخوێننەوە).

ئاشكرایە كەتیۆری یادەوەری و رێبازی بنەما یان سەرچاوەی خودایی ناسینی مرۆڤ پەیوەندییەكی لەپچڕان نەهاتوویان پێكەوە هەیە. و هاوتەریب لەگەڵ ئەم پەیوەندیەدا، پەیوەندییەكی زۆر نزیك لەنێوان تیۆری یادەوەری و رێبازی تایبەتمەندی رۆشنی حەقیقەتیشدا هەیە. ئەگەر ئێمە، هەر لەوكاتەدا كەنوقمی لەبیرچونەوەی تاوانكارانەین، حەقیقەت ببینین مەحاڵە نەیناسینەوە. لەئەنجامدا، حەقیقەت بەنوێ بوونەوەی بیرەوەری، پێگە تایبەتیەكەی خۆی، واتە ئەوەی كەلەبیرنەچۆتەوەو نەشاردراوەتەوە (aletfes) بەڵكو شتێكە كەئاشكرایە، بەدەست دێنێتەوە.

سوقرات لەبەشێك لەنامیلكەی مینوندا، كەیارمەتی كۆیلەیەكی لاوی بێبەش لەفێربوون دەدات، هەتا لایەنێكی تایبەت لەمەسەلەی فیساغۆرسی "بیر بكەوێتەوە"، بەشێوەیەكی زۆر لێزانانە ئەمە پیشان دەدات. ئەمە شێوەی





پراكتيكى ئەبتسمۆلۆژيى گەشبينانەيە كەشێوازى كۆنى قوتابخانەى ديكارتە. بەڵام وا دێتە پێش چاو كەئەفلاتوون لەمينۆندا بەلايەنى ئەوپەڕى گەشبينانەى تيۆريەكەى خۆى زانيوە چونكە ئەوى وەك شێوازێك بۆ هاندانى مەيلى فێربوون و لێكۆڵينەوەو دۆزينەوە لەمرۆڤدا وەسف كردووە.

بەڵام پێدەچێ ئەفلاتوون دواتر دوچارى جۆرە دڵساردييەك هاتبێ چونكە لەكتێبى كۆمار(و هەروەها لەناميلكەى فيدرس)دا پلانى تيۆرەيەكى ناسين دەبيندرێ كەڕەشبينانەيە. ئەفلاتوون لەچيرۆكى ئەشكەوتدا پيشانى دەدا كەجيهانى هەستپێكراو و ئەزمونى رەنگدانەوەو سێبەرى جيهانى راستييە. تەنانەت ئەگەر يەكێك لەزيندانييەكان لەئەشكەوتەكە راكات و رووبەڕووى جيهانى راستى ببێتەوە ناتوانێ ببينێ و لێى تێبگات مەگەر ئەوەى گيروگرفتێكى لەچارە نەهاتووى بەتووشەوە بێت ـ باواز لەو گيروگرفتانە بهێنين كە بۆ تێگەياندنى مەسەلەكە لەو كەسانەى لەئەشكەوتدا ماونەوە، تووشى دەبێ ـــ بەربەستەكانى سەر رێى تێگەيشتن لەجيهانى راستى



توانايەكى سەرو مرۆيى دەوێ و كەم كەس ـ ئەگەر هەبن ـ دەتوانن بگەنە ئەو دۆخە خواييەى كەبتوانن لەجيهانى راستين بگەن" بەدۆخى خوايى ناسينى راستين، بەزانست (بەيۆنانى ئەپستيمە episteme).

رەشبينى ئەم تيۆرە سەبارەت بەزۆربەى خەڵكى (نەك هەموان) راستە (لەڕاستيدا ئەم تيۆرە وامان فێر دەكات كەچەند كەسێك ـــ هەڵبژاردەكان ـــ شايستەى ئەوەن بەحەقيقەت بگەن. دەكرێ بڵێين گەشبينى ئەم تيۆرە لەسەر ئەو كەسانە لەتيۆرى تايبەتمەندى رۆشنى حەقيقەت، زۆرترە) ئاكامەكانى دەسەڵات خوازانەو نەريتخوازانەى ئەم هەڵێنجانە رەشبينانەيە لەكتێبى ياساكانى (ئەفلاتون) بەتەواوى شيتەڵ و رۆشن كراوەتەوە.

بەم شێوە بۆ يەكەمين جار فەسلەفەكەى ئەفلاتون، لەئەبستمۆلۆژى گەشبينانەوە دەماتگەينێتە ئەبستمۆلۆژيى رەشبينانە. هەركام لەم دوو تێگەيشتنە پێكهێنەرى بنەماى يەكێك لەدوو فەلسەفەى دەوڵەت (دەوڵەتى كۆمەڵايەتى)ن، كەبەتەواوى دژى يەكترن: لەلايەك، ئەقڵگەرايى دژى

نـەریتخوازی، دژی دەسـەڵاتخوازی، شۆڕشـگێڕیو دڵخـوازی دیکارتییـــە، لەلایـــەکی تـــرەوە، نـــەریتخوازیی دەســـەڵات خوازانە.

تـــەواو پێدەچـــێ ئـــەم ئـــاڵوگۆڕە هزریـــە لـــەوەوە بێـــت کەئەندێشـەی دابـەزینی ئەبسـتمۆلۆژیانەی مـرۆڤ نـەك تـەنیا دەتوانـــێ لەبەرامبـــەر لێکدانـــەوەی گەشـــبینانەی تیـــۆری (یادەوەری)دا خـۆی راگـرێ، بـەڵکوو دەشـتوانێ تەحـەمووڵی لێکدانەوەیەکیتری بەتێگەیشتنێکی رەشبینانەوە هەبێت.

بەگوێرەی ئەم لێکدانەوەیە، دابەزینی مرۆڤەکە هـەموان ـ یـان زۆرینەیـەکی گـەورە ـ دەکاتـە دیلـی نـەزانی بەرواڵـەت لەچـیرۆکی ئەشـکەوت (و هـــەروەها بێگومـــان لەچـــیرۆکی دارمـــانی کۆمـــەڵگا بـــەهۆی فـــەرامۆش کردنـــی مۆســـەکانو تەعالیمـە خواییـەکانیان (کۆمـار، بەنـدی 546 d)دا دەتوانـێ شـــێوەیەکی ســـەرەتایی ســـەرنجراکێش لـــەم ئەندێشـــەیە ببینـــرێ. ئـــەویش روانگـــەی پارامیندیســـە کەبـــەپێی ئـــەو روانگەیـــە، بـــیرو بـــڕوای مرۆڤـــەکان لەخـــەیاڵات زیـــاتر نـــینو ئاکامی رێککەوتنامەیەکە کەبناغەیەکی خوایی هەیە (رەنگـە



ئـــەم ئەندێشـــەیە هـــی گزەینـــەفۆن[18] بێـــت کەبـــەبڕوای ئـــەو سەرجەمی زانابیەکانی مرۆڤ خـەیاڵاتێکی رووتـن، و تەنانـەت تیۆریـەکانی خۆیشـی لەباشـترین حاڵەتـدا، نیمچـە راسـتن)[19] بناغەی ئەم رێککەوتنامە نەگریسە، زمانە: ناولێنانی شتێکە کەبوونی نیە. وەك کارێل رێنهارد[20] دەڵـێ، رەنگـە ئەندێشـەی دابەزینی ئەبستمۆلۆژیانەی مرۆڤ لەوتاری ژنە خواوەندێکدا بێـــت، کـــەدەربڕی لادان لـــەرێگای حەقیقەتـــە بـــەرەو رێگـــای بیروباوەڕە هەڵخەڵەتێنەرەکان[21].

بەڵام تۆ فێردەبی کەبیروبڕوا هەڵخەڵەتێنەرەکان،

کەدەیانەوێ وەك حەقیقەت بناسرێن،

---

[18] xenophane (کۆتایـەکانی سـەدەی شەشـی بەرلـەزایین)، فەیلەسـووفی یۆنانی.. وەرگێڕی فارسی

[19] ئاماژەی ئێمە بەپارچەی B 35 لەپارچە جێماوەکانی گزینەفۆنە

[20] . Karl Reinhardt

[21] . cf. K. Reinhardt, parmenides und die Geschichte der Griechischen philosophis, Klostermann, 1959, p. 26; cf. e’galement, p.5- 11 pour Les deux premiers vers cite’s ici(B1. W. 31- 32) Le troiseme vers correspond au fragment B8.7.60(cf. xe’nophane, B35), le dernier, ab8.v.61.





چلۆن لەهەر شتێکدا ڕێگایەك بۆ خۆیان دەکەنەوە (..)
ئێستاش دەمەوێ لەگەڵ تۆدا لەو جیهانە بدوێم
کەوا دروستیان کردوە لەحەقیقەت بچێت.
ئیتر تۆ هەرگیز، عەودالّی ناو بیرکردنەوەکانی مرۆڤەکان نابی.

سەرئەنجام هەرچەند هاتنەخوارەوە پەیوەندی بەهەموو مرۆڤەکانەوە هەیە بەڵام پێدەچێ بەهۆی ئیمتیازێکەوە، حەقیقەت ـ تەنانەت حەقیقەتی جیهانی ناواقعی خەیاڵات، بیروبڕواکان، تیۆریەکان‌و، ئەو بڕیارانەی مرۆڤەکان لەسەری ڕێککەوتوون: جیهانی لەئارادا نەبووی رواڵەت، کەدەیەوێ وەك جیهانی راستی بسەلمێ‌و وەرگیرێ ـ بۆ هەڵبژاردەکان دەرکەوێ[22].

دوو مەسەلەی گرنگ کاری کردە سەر فەلسەفەکەی ئەفلاتوون: دۆزینەوەکەی پارامینیدس و بڕوای ئەو بەوەی

[22] جێی خۆیەتی ئەم تێگەیشتنە ڕەشبینایەی پێویستی (هەڵە) لەگەڵ گەشبینی دیکارت وسپینۆزادا بەراورد بکەین (مادەی 5 لەنامەی حەفتاو هەشت)، چونکە ئەوان بەسووك سەیری ئەو کەسانەدەکەن کەوا بیر دەکەنەوە "گیانە ناپاکەکان، لەجیاتی ئەندێشە راستەکان، ئەندێشە ناڕاستەکان دەخەنە مێشکی مرۆڤەوە (veris similis)".



کەژمارەیەکی کەم لەمرۆڤەکان دەتوانن باوەڕ بەبوونی راستینی نەگۆڕو نەمری بێنن، هەر بەوشێوەی کەبڕوایان بەجیهانی لەئارادا نەبووی بگۆڕو لەڕاستی چووی[23] نادیار، هەیە ئەفلاتوونیش، عەودالّ لەنێو هیواو ناهۆمێدی‌و خۆبەدەستەوەداندا، بەردەوام ئەمەی وتۆتەوە.

## (8)

بەڵام ئەوەی لێرەدا جێی سەرنجی ئێمەیە ئەبستمۆلۆژیای گەشبینانەی ئەفلاتووون‌و تیۆری یادەوەریە کەیەتی کەلەکتێبی مێنوندا باسی کردوە. بەبڕوای من هەردوو تیۆرییەکە، نەك تەنیا وێنەگەلی پێشتری ئەقڵگەرایی دیکارتین بەڵکو، هەروەها وێنەگەلی پێشتری تیۆریەکانی ئیستقرایی ئەرەستوو، بەتایبەتیش بیکۆنن.

لەراستیدا پرسیارە بەجێکانی سوقرات یارمەتی کۆیلەکەی مینۆن دەدەن هەتا زانیاریە لەبیرچۆوەکەی وەبیر

[23] بەئینگلیزی verismilitude (بەفەرەنسی 've'rismilarite') .





بێتەوە کەبەر لە لەدایك بوون واتە ئەوکاتەی کەهەموو شتێکی زانیوە، لەدەروونیدا هەبووە. من لەو بڕوایەدام ئەرەستوو، لەو شوێنەدا کەدەڵێ سوقرات شێوازی ئیستقرایی داهێنا، ئاماژە دەکات بەم شێوازە بەناوبانگەی سوقرات کەلەکتێبی تێئەتێتووسی(ئەفلاتون)دا بەهونەری بەدنیاهێنان یان مامانی (مایوتیك maueutique) ناسێنراوە[1].

بەبڕوای من مەبەستی ئەرستۆ و بیکۆن لە "ئیستقرا" زیاتر لەوەی کەگەڕانەوە بێت، لەسەر بنەمای روانینە تایبەتیەکان، بۆ سروشت، هەنگاوێکە بۆ گەیاندنی ئێمە بەجێیەك کەبتوانین بەپشکنین لەنیوەڕۆك (جوهر) یان زاتی راستینی شتێك تێبگەین[2]. بەڵام هەروەك دەرمانخست

---

[1]. Metaphysique, m . 1078 b 17-33icf egalement 987 b1,

[2]. دەستەواژەی "ئیستقرا" (بەیۆنانی epagoge)، لەڕوانگەی ئەرەستۆوە لانی کەم دوو شتی جیاواز دەگەیەنێ کەنووسەر بڕێك جار پێی وایە پێکەوە پەیوەندیان هەیە. لە حاڵەتی یەکەمدا ئیستقرا کارێکە کەلەڕێگای پشکنینەوە بنەمایەکی گشتیمان تێدەگەیەنێ. (لێکۆڵینەوەی یەکەم، سەبارەت



ئامانجی مامانیەکەی سوقرات رێك ئەمەیە: مەبەست ئەوەیە کەبیرەوەریەك نوێ ببێتەوە یان مرۆڤ رێنوێنی بکرێ بۆ نوێ بوونەوەی بیرەوەرییەك‌و، وەبیرهێنانەوە توانای مرۆڤە بۆ

---

بەوەبیرهێنانەوە لەمێنوندا 67 a22، و لێکۆڵینەوەی دووهەم viav) لەحاڵەتی دووهەمدا ئێمە لەگەڵ شێوازێك سەروکارمان هەیە (توبیفا "هونەری مشتومڕ" 150A13، 156A4، توبیقای دووهەم 78635، 81 b5 بەدواوە) کەکارەکەی لەسەر بنەمای شێوازێکی توێژینەوەیی، بەبێ ناوەڕۆکی رەخنەئامێزی یان ئاماژەکردن بەنموونە دژەکان، لەبوارە (جیاجیاکان)ەوە دەست پێدەکات. بەبڕوای من شێوازی یەکەم کۆنترین شێوازەودەکرێ بەئاسانی ئەو شێوازە لەگەڵ شێوازی مامانیی سوقراتدا، بەبوونی لایەنی رەخنەئامێزی‌و نمونە دژەکانیەوە، وەك یەك بزانین، بەڕواڵەت شێوازی دووهەم لەهەوڵێکەوە سەرچاوە دەگرێ کەبۆ رێك‌وپێك کردنی ئیستقرای تیۆری لۆژیکی یان وەك ئەرەستۆ دەڵێ (لێکدانەوەی یەکەم 68 b 10 بەدواوە) بەمەبەستی دامەزراندنی پێوانەیەکی (باوەڕپێکراو) لەسەر بنەمای ئیستقرایە، ئەم پێوانەیە دەبێ حەتمەن پێوانەیەکی تەواو هەمەگیر بێت هەتا ببێتە جێگای ئیعتبار (متمانە) (دەبێ سەرجەم لایەنەکان لەخۆ بگرێ) ئیستقرای ئاسایی، بەو واتایەی کەلەشێوازی دووهەمدا کاری پێدەکرێت حاڵەتی لاواز (و بێ ئیعتباری) شێوازی یەکەمە.

.(cf. The open solciety, op. Cit. , chap. 11, note 33)





بینینی سروشتی راستین یان نێوەڕۆك (جوهر)ی شتێك واتە ئایدیا كەبەرلەوەی لەدایك بێت، بەرلەدابەزین، شارەزایی لێیان بووە. بەم جۆرە دوو شێوازی مامانی و ئیستقرا، ئامانجگەلێكی وەك یەكیان هەیە. جیا لەوە ئەرەستۆ وای فێركرد كەئاكامی ئیستقرا ــ دۆزینەوەی ماك (جوهر)ی شتەكان . دەبێ بەپێناسەكردنی ماكی دەرببڕدرێ.

هەركات وردی لەم دوو شێوازە بكۆڵینەوە تێدەگەین كەهونەری مامانی سوقراتی زۆرتر هێنانەگۆڕی پرسیارگەلێكە بۆ نەهێشتنی حوكمدانە پێشوەختەكان‌و بیروبڕوا ناراستەكان كەزۆرتر بەرهەمی نەریت یان خووەكانی سەردەمن‌و، وەڵامگەلێكی ناراستن كەلەنەزانیەكی زۆر خۆبەزلزانانەوە سەرچاوە دەگرێ.

سوقرات خۆی بەزانا نەدەزانی. ئەرەستۆ بەم جۆرە باس لەرەوشی سوقرات دەكات:



"سوقرات پرسیاری دەكردو وەڵامی نەدەدایەوە چونكە دانی بەوەدا دەنا كەهیچ نازانێ"[3] هەر بۆیە، مامانیەكەی ئەو شێوازێك نیە بۆ فێركردنی بیروبڕوایەكی تایبەت، بەڵكوو بەپێچەوانەوە شێوازێكە بۆ پاك‌وخاوێن كردنەوەی دەروون (بگەڕێنەوە بۆ ئەو ئاماژەیەی كەلەژمارەی 160c تێئەتیتوسی ئەفلاتووندا بەئامفید رۆمیا[4] كراوە) لەبیروبڕوا ناڕاستەكان، لەراست چووەكان‌و حوكمدانە پێشوەختەكان. شێوازی مامانی بەفێركردنی ئێمە بەوەی كەبیروبڕواكانمان بكێشینە ژێر پرسیار، بەئامانجەكەی دەگات. ئیسقرا بەشێوەی بیكۆنیش لەبنەڕەتدا شێوەیەكی ئەوە.

---

[3]. Re Futatons sophistiques, 183 b 7 cf. galement Teetete, 150c-d, 157 c, 161b

[4]. Amphidromia (وشەیەكی یۆنانیە) جێژنێكە بۆ تازە لەدایكبووان (بۆ كۆرپەی ساوا)، لەپێنجەم رۆژی لەدایك بوونیدا، لەو جێژنەدا كۆرپەساواكەیان دەگرتە باوەش‌و بەدەوروبەری خانووەكەیاندا رایان دەكرد. (وەرگێڕی فەرەنسی).





## (9)

**ئێستا باس لەشێوازیکاری تیۆری ئیستقرایی بیکۆن دەکەین. بیکۆن لەکتێبی ئەرغەنوونی[1] نوێدا جیاوازی لەنێوان شێوازی دروستو شێوازی نادروست دادەنێ. ناوێك کەلەسەر یەکەمدانەیان دایدەنێ: " interpretatio natura" وەك باوە بە "لێکدانەوەی سروشت" دەخوێندرێتەوەو، دووهەم دانە، واتە "anticipatio mentis" بە "وەپێش کەوتنەوەی زەین" یان "پێشبینی زەینی" دەخوێننەوە[2]. بەڕواڵەت ئەم لێکدانەوانە ڕۆشنن بەڵام لەڕاستیدا فریودەرن. بەبڕوای من مەبەستی بیکۆن لە"لێکدانەوەی سروشت" خوێندنەوەی سروشتو یان باشتر بڵێین کردنەوەی ڕەمزو ڕازەکانی کتێبی سروشتە[3].**

---

1. Novum organum
2. CF. Novum organum ,notamment I, xxvi
(یاداشتی وەرگێڕی فەرەنسی).

3 لەبەشێکی بەناوبانگی کتێبی II saggiatore (بەشی شەشەم)، (کە بۆنز (M.Bunge) دۆستانە وەبیری هێنامەوە،گالیلۆ ڕستەی: "کتێبی مەزنی



**بێگومان وشەی "لێکدانەوە"[4] لەزمانی ئینگلیزیی نوێدا ناوەڕۆکێکی زەینی یان ڕێژەیی هەیە. کاتێك دەڵێین ڕۆدۆلف سێرکین[5]. ڕێبەری ئۆرکیسترای ئیمپراتۆر، بەرهەمی بێتهۆڤنی، جیّبەجیّ کرد (ئەنجامدا) (لەزمانی ئینگلیزیدا بەجیّبەجیّکردنی پارچە مۆسیقایەك دەڵێن تەعبیر کردن.. وەرگێڕی فارسی).**

**مەبەستی ئەوەیە کەجیّبەجیّکردن (لێکدانەوەگەل)ی جۆراوجۆر لەم ئاهەنگە هەیەو ئەو جیّبەجیّکردنەی ئێمە مەبەستمانە، بەڕێوەبردن (لێکدانەوە)ی سێرکینە. بەدڵنیاییەوە ئێمە نامانەوێ بەوتنی ئەم ڕستەیە بڵێین کەئەم پێشکەش کردنە باشترین، دروست ترین، نزیکترین جۆری پێشکەشکردنە بەوەی کەبیتهۆڤن دەیەوێ. بەڵام هەر لەو**

---

سروشت کەلەبەردەمماندا واڵا کراوە، واتە جیهان" ی بەکارهێناوە. هەروەها سەیری کتێبی شێوازی دروستی بەکارهێنانی ئاوەز بکەن کەبەرهەمی دیکارتە.

4. interpretation
5. Rudolf sekin (1903–1991)، پیانۆژەنی ئەمریکی بەڕەچەڵەك ڕووسی. وەرگێڕی فارسی.





کاتەدا کەئەوە بەباشترین جۆری پێشکەش کردن (دەربڕین) نازانین، هەرئەوەندەی کەوشەی (دەربڕین) بەکاردێنین ددانمان بەبونی جۆرەها پێشکەشکردن یان خوێندنەوە (لێتێگەیشتنە)کاندا ناوە کەدەشێ بونیان هەبێ بەبێ ئەوەی کەبمانەوێ پێ لەسەر بایەخی هاوکێشی ئەو پێشکەشکردنانە (لێتێگەیشتنانە) داگرین.

من لێرەدا وشەی "خوێندنەوە" (بەواتای لێتێگەیشتن) لەجیاتی لێکدانەوە بەکاردەهێنم، نەك تەنیا لەبەرئەوەی کەواتاگەلێکی زۆر نزیکیان هەیە بەڵکوو لەبەرئەوەش کەواتای "کاری خوێندنەوە" (بەواتای ناوی کردار= خوێندنەوە) و "خوێندنەوە": (کاری خوێندنەوە لەحاڵەتی "ئێستا ئیتر لەگەڵ "لێکدانەوە" و "خوێندنەوە" وەك یەکیان لێهاتووە، جیا لەوەی کەبەکارهێنانی کۆن و نوێی "کردەی خوێندنەوە": هەردووکیان تەواو باون. لەڕستەی "من نامەکەی ژانم خوێندەوە" ، ئەم وشەیە بەبێ هیچ مەبەستێکی تری زەینی بەواتا باوەکەی بەکارهاتووە بەڵام ئەم رستانە: "من بەشێوەیەکیتر ئەم بەشە لەنامەی ژان



دەخوێنمەوە: و یان "خوێندنەوەی ئەم دەستەواژەیە بۆ من جیاوازە" نموونەگەلی بەکارهێنانی وشەی "خوێندنەوە" (بەواتا کردارییەکە)یەتی کەتوخمی شێوە بیرکردنەوەیان رێژەیی بوون لەواندا بەشدارە.

بەڵام من قسەم ئەوەیە کەواتای "لێکدانەوە"ش رێك بەو شێوە گۆڕدراوەی، جیا لەیەکەم واتا ــ بێگومان واتای "بەدەنگی بەرز خوێندنەوە بۆ کەسێك کەخۆی ناتوانێ بخوێنێتەوە" ــ ئیتر بەکردەوە لەئارادا نەماوە. لەئێستادا تەنانەت رستەی "دادوەر دەبێ هەق بڵێت[6] " ئەو مانایە دەبەخشێ کەدادوەر لەم کارەدا بڕێك دەسەڵاتی هەیە، لەکاتێکدا کەئەم رستەیە لەسەردەمی بیکۆن دا ئەم واتایەی دەبەخشی: ئەرکی سەرشانی دادوەرە وا باسی هەق کات کە هەیە " دەربڕی هەق بێت، بەرێكوپێکی هەق جێبەجێبکات. لێکدانەوەی یاسایی "interpretatiojuris" (یان Legis)، یان ئەم واتایە دەبەخشێ، یان بەواتای دەربڕینی هەق بۆ غەیری

[6] interpret the law





ياساناس بەكاردێ[7]. لەم روانگەیەوە، لێكدەرەوە(جێبەجێ كەری) ی یاسا هیچ دەسەڵاتێكی نیە یان لانی كەم ئیختیارەكەی لەوەرگێری سوێندخواردوو زۆرتر نیە، كەبەڵگەیەكی یاسایی وەردەگێرێت.

كەواتە شیاو نیە كە بە (خوێندنەوەی سروشت) مانا بكرێتەوە. دەبێ لەجیاتی ئەو شتێكی وەك "خوێندنەوەی (دروستی) سروشت" كەهاوتای "خوێندنەوەی (دروستی) هەق"ە دابندرێ.

من پێم وایە بیكۆن ویستوویەتی بڵێ ئەم كارە بریتیە لە : "خوێندنەوەی سروشت وەك هەیە: یان "كردنەوەی رەمزو رازی كتێبی سروشت". لەراستیدا ئەو فرمۆڵەی كەهەڵیدەبژێرین دەبێ دوور بێت لەتێگەیشتنە نوێكەی وشەی "لێكدانەوە". و نابێ پشت بەگریمانەكان، یا ئەو هۆكارە نادیارانەی زەمانەتی بیرۆكەی هەوڵدان بۆ

[7] Cf. Bacon. De augmentis..vi , xivi et T. manley. The Interpreter (..) obscure words and Terms used in the Lawes of this Realm. S 1. , 1672.



لێكدانەوەی شتە ئاشكراكانی سروشت دەكەن، ببەستێت. چونكە لەم حاڵەتەدا پێشبینی زەینی دەبێ، بەو واتایەی كەبیكۆن مەبەستیەتی. هەڵبەت بەبڕوای من هەڵەیە ئەگەر خزمایەتی گریمانەگەلێك دروست بكات چونكە ئیستقرای بیكۆن وەك بانگەشە دەكات ناسینێكی یەكجارەكی دێنێ نەك گریمانەیی.

بەلام جێی خۆیەتی سەبارەت بەواتای زاراوەی "پێشبینی زەینی" وتەی جۆن لۆك بهێنینەوە: "مرۆڤەكان هەمیشە ملكەچی یەكەمین پێشبینی زەینی خۆیان دەبن[8]" ئەم قسەیە واتاكردنەوەی قسەكەی بیكۆنە، ئەم واتاكردنە بەڕوونی دەریدەخات كەپێشبینی "ANTICIPATIO" بەواتای حوكمدانی پێشوەختەو، تەنانەت خورافەیە. هەروەها دەكرێ سوود لەدەستەواژەی " anticipatio deorum" وەربگیرێ كەمانای بوونی خواوەندگەلێكی وەرووخەری خەیاڵاتی خۆش باوەڕوانەو سەرەتایی یان

[8] De Laconduite de lentendement, paris, Vrin, 1975 (trad. Y . nicheud), s 26





خورافی دەگەیەنێ. بەڵام دەکرێ بابەتەکە زیاتریش شیتەڵ بکرێتەوە: حوکمدانی پێشوەخت[9] لەوشەی دادوەرییەوە وەرگیراوە، ئەگەر قاموسی ئینگلیزی ئۆکسفۆردمان قبووڵ بێت ئەوا بۆ یەکەم جار بیکۆن کرداری حوکمدانی پێشوەخت (to prejudge)، بە واتای "پێشاوپێش حوکمدانێکی نالەبار"، واتە لەئەرکەکانی دادوەر[10] واوەتر رۆشتنی، هێناوەتە ناو زمانی ئنیگلیزییەوە.

بەم جۆرە دوو شێوازە پێشنیارکراوەکەی بیکۆن بریتین لە :"کردنەوەی رەمزو رازی کتێبی ئاوەڵای سروشت" کەناسین یان زانستی[11] لێدەکەوێتەوە پێشوەخت حوکمدانی زەینی کەبەهەڵە یان تەنانەت بەخەتا دادوەری لەسەر سروشت دەکات" بەدۆکسا[12] یان لێکدانەوەیەکی سادەو

9 سەیری کتێبی بنەماکانی دیکارت بکەن، I ، 50.

10. Cf. Advancement of Learning, Londres, Dent, 1973. I. V. 82.

(یاداشتی وەرگێری فەرەنسی)

11. episteme

12. doxa



ساکارو، هەروەها بەهەڵە خوێندنەوەی کتێبی سروشت کۆتایی دێت. شێوازی دووهەم، کەبیکۆن رەتیدەکاتەوە لەڕاستیدا شێوازی لێکدانەوە بەواتا نوێکەیەتی، شێوازی شیمانەو گریمانەکانە، (هەڵبەت من بەتەواوەتی لایەنگری ئەم شێوازەم).

بەڵام چۆن چۆنی خۆمان بۆ خوێندنەوەی دروستو وەفادارانەی سروشت تەیار بکەین؟ بیکۆن بەم جۆرە وەڵام دەداتەوە: دەبێ مێشك لەهەر چەشنە پێشبینیو گریمانەو گومانو حوکمدانێکی پێشوەخت[13]، پاك بکەینەوە. دەبێ بۆ ئەم پاککردنەوە زەینیە کەڵك لەشێوازگەلی جۆراوجۆر وەربگرین. دەبێ دەست لە "بتە" کانو بیروبڕوا ناڕاستەکان هەڵگرین کەزۆر ڕەواجیان،هەیە چونکە ئەمانە روانینەکانمان بەلاڕێدا دەبەن[14]. بەڵام دەبێ وەك سوقراتیش مەسەلەو نمونە دژەکان بدۆزینەوە. ئەم نموونانە بواری ئەوەمان دەدەنێ سەبارەت بەوشتەی کەدەمانەوێ ناوەڕۆکی راستینو

13. Novum organum, I, LXV III, LXIX in fine

14. Ibid, I, xcv II





زاتی ئەومان بۆ دەرکەوێ، حوکمدانە پێشوەختەکانمان باشتر هەڵسەنگێنین، ئێمەش دەبێ وەك سوقرات بەپاك کردنەوەی زەینی خۆمان، دەروونمان بۆ بینینی تیشکی نەمری ئایدیا ئامادە بکەین[15]؟ دەبێ بەهاوکاری نموونە دژەکان، حوکمدانە پێشوەختە چەپەڵەکانی خۆمان وەلانێین[16].

تەنیا دوای ئەوەی کەبەم شێوەیە خۆمان پاك کردەوە دەتوانین خۆمان بەکردنەوەی رەمزو رازی کتێبی سروشتو، حەقیقەتی رۆشنەوە خەریك بکەین.

بەبڕوای من بەپێی ئەم بەڵگانە، ئیستقرا بەشێوازی بیکۆن)( و بەشێوازی ئەرەستۆش) لەبنەمادا وەك مامانیەکەی سوقرات وایە: هەرکات حوکمدانە پێشوەختەکانمان وەلانا دەبێ مێشکمان بۆ سەرلەنوێ ناسینەوەی حەقیقەتی ئاشکرا و روون یان خوێندنەوەی کتێبی سروشت ئامادە بکەین.

---

15. cf. saint Augustin, La Cite de Dieu, V III, 3
16. Novum organum, II, XVI, sqq



شێوازی گومانی دیکارتیش، لەبنەڕەتدا هەرئەمەیە: شێوازێکە بۆ وەلانانی سەرجەم حوکمدانە پێشوەختە ناڕاستە زەینییەکان بەمەبەستی گەیشتن بەبناغەیەکی پتەو کەحەقیقەتی ئاشکرا پێکیدەهێنێ.

ئێستا باشتر تێدەگەین کەبۆ ئەبستمۆلۆژیای گەشبینانەی لەم چەشنە تێگەیشتنە، تێگەیشتنێك کەحاڵەتی سروشتی یان پاكو بێگەردی مرۆڤە، حاڵەتی روانینێکی بێتاوانانەیە کەدەتوانێ حەقیقەت ببینێ و لەکاتێکدا کەنەزانی، سەرچاوەگرتوو لەبریندارییەکە کەئەم روانینە بێ تاوانە، لەکاتی دابەزینی مرۆڤدا تووشی بووە، برینداریيەك کەدەشێ بەپاککردنەوە بەشێکی چارەسەر ببێت. هەروەها باشتر تێدەگەین کەبۆچی ئەم تیۆری زانینە، لەشێوە دیکارتیەکەیداو، هەروەها لەو شێوەیەیدا کەبیکۆن دەیداتێ، لەناخیدا رێبازێکە بەناوەڕۆکی ئاینییەوە، کەبەپێی ئەو رێبازە بنەمای تەواوی زانایيەکان، سەرچاوەی دەسەڵاتێکی خودایی هەیە.





دەكرێ بڵێین كەئەپستمۆلۆژیای بیكۆن لەژێر كاریگەری "ناوەڕۆكەكان" یان "چییەت"ییە خوداییەكانی فەلسەفەی ئەفلاتوون و، ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان حەقیقەت و تایبەتمەندی خەیاڵئامێزی ڕێككەوتنامە مرۆییەكان، كەلەناو یۆنانیەكاندا برەوی هەبووە، سروشت لەجیاتی خواوەند دادەنێ و ڕەنگە هەر ئەم خاڵە دەربڕی ئەوە بێت كەبۆچی دەبێ مرۆڤ بە نزیك بوونەوە لەسروشت پاك ببێتەوە: هەركات زەینمان پاكبكەینەوە هەستەكانمان، كەهەندێك جار فریو دەرن(ئەفلاتوون ئەوانە بەناپاكی لەچارە نەهاتوو دەزانێ)، پاك دەبنەوە، دەبێ پاكی و بێگەردی سەرچاوەكانی ناسین بپارێزین، چونكە مەترسی ئەوە لەئارادایە كەببن بەسەرچاوەكانی نەزانی.

## (10)

لەگەڵ ئەوەشدا كە ئەبستمۆلۆژیاكانی بیكۆن و دیكارت لایەنی ئاینییان هەیە، هێرشی ئەو دووانە بۆ سەر حوكمدانە پێشوەختەكان و بڕوا كۆنەپەرستەكان، كە مرۆڤ بەهۆی



كەمتەرخەمی و گوێنەدانەوە، وەری دەگرێ، بەئاشكرا بنەمای دژە دەسەڵاتخوازی و دژە نەریتخوازی هەیە. لەراستیدا ئەم دوو فەیلەسووفە خوازیاری ئەوەن كە ئێمە سەرجەم بڕواكانی خۆمان، جیا لەوانەی كە خۆمان لەراستیەكەیان تێگەیشتووین، وەلانێن. كەواتە بێگومان ئەم هێرشانە ڕووی لە دەسەلات و نەریت بووە، لە خەبات دژی دەسەڵات، لە دژی دەسەڵات ئەرەستۆو نەریتی قوتابخانەیی(ئیسكۆلاستیك)ەوە سەرچاوەی دەگرت كە ئەو سەردەمە باو بووە، جا لەبەر ئەوەی مرۆڤەكان توانای تێگەیشتن لە حەقیقەتیان هەیە، پێویستیان بەم چەشنە دەسەڵاتانە نیە.

بەڵام من لەو بڕوایەدا نیم كە بێكۆن و دیكارت توانیبێتیان بەتەواوی ئەبستمۆلۆژیاكەی خۆیان لە پشتبەستن بە هەر جۆرە دەسەڵاتێك (سەرچاوەیەكی باوەڕپێكرا) بپارێزن و ئەمە كەمتر بەهۆی گەڕانەوە بووە بۆ دەسەڵاتێك لە جۆری ئایینی– سروشت یان خواوەند– بەڵكو هۆكارێكی دیكەی هەبووە كە ئەویش قووڵترە.

ئەوان بە پێچەوانەی لایەنگیری تاکخوازی ئەندێشەکانیانەوە ئەوەندە نەچوونەپێش کە فیکری رەخنەگری مرۆڤ، داوەری من و تۆ وەك پێوەر سەیرکەن. بێگومان وایان بیر کردۆتەوە کە رەنگە ئەم کارە زەیینگەرایی‌و خۆپەرستی لێبکەوێتەوە. بەڵام هۆکارەکەی هەرچییەك بووبێت، بە دڵنیاییەوە ئەوان، هەرچەند زۆریان حەزدەکرد، نەیانتوانیوە بەبێ پشتبەستن بە سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو(دەسەڵات) بیر بکەنەوە، تەنیا توانیویانە دەسەڵاتێك لە جێگای دەسەڵاتێکی دیکە– دەسەڵاتی ئەرەستۆو کتێبە پیرۆزەکان– دانێن. ئەوان هەر کامەیان دەست بەدامێنی سەر چاوەیەکی باوەڕ پێکراوی دیکە بوون: یەکێکیان دەستەوداوێنی هەستەکان، ئەوی تریان دەست بەدامێنی شعور(هۆشیاری) بووە.

ئەم قسەیە بەو مانایەیە کە بیکۆن و دیکارت نەیانتوانیوە ئەم مەسەلە گەورەیە چارەسەر بکەن: چۆن قبوڵی بکەین کە ناسینی ئێمە مەسەلەیەکی مرۆیی– زۆریش مرۆیی– یەو لە هەمانکاتدا بە شێوەیەکی



پاڵەکی(زمنی) نەیسەلمێنین کە ناسین جیا لە خەون و خەیاڵ و خۆپەرستی مرۆڤ شتێکی دیکە نیە؟

لەگەڵ ئەمەشدا کە زۆر پێش ئەوان، ئەم مەسەلە باس و چارەسەرکرا بوو: وەك دەڵێن یەکەم جار لەلایەن گزەنفۆنەوەو، پاشان لەلایەن دیمۆکریتەوە[1] و دوای ئەو لەلایەن سوقراتەوە (سوقراتی کتێبی ئەپۆلۆجیا(داکۆکی) نەك، سوقراتی کتێبی مێنون) بەم شێوەیە چارەسەری مەسەلەکە دەکرێ کە: ئەگەر ئێمە هەموومان تووشی هەڵە دەبین و زۆر جاران بەتاك و بە کۆمەڵ هەڵەدەکەین، ئەندێشەی هەڵەو هەڵە کردنی مرۆڤ رێك ئەندێشەیەکی دیکە دێنێتە ئاراوە، ئەو ئەندێشەیەش حەقیقەتی بابەتی یان نەریتێکە کە وەك پێویست دەستمان پێی ڕاناگات. لە ئەنجامدا نابێ وا بیر بکەینەوە کە ڕێبازی هەڵەکاری مرۆڤ بەرهەمی تیۆری زانستیی رەشبینانەیە. بەپێی ئەم رێبازە ئێمە شیاوی ئەوەین بە شوێن حەقیقەتدا، حەقیقەتی بابەتی (عەینی)دا بگەڕێن ئەگەر چی زۆر جار بە ئامانجەکەمان

[1] Democrite (460 – 370 بەر لە زایین) فەیلەسوفی یۆنانی.





ناگەین. ئەگەر ئێمە ستایشی حەقیقەت دەکەین دەبێ پێداگرانە، بەرەخنەیەکی ئەقڵانیو رەخنە لە خۆگرتن هەموو کاتێك لە رێگای ئاشکراکردنی هەڵەکانی خۆمانەوە، بە دواییدا بگەڕێین.

ئێراسم[2] هەوڵیدا هەتا سەرلەنوێ فێرکاریەکانی سوقرات بژێنێتەوە، ئەو فێرکاریانە کە لە هەمانکاتدا سادەن و بێ ئیدیعابوون، لێبڕاوانەش بوون:(خۆت بناسەو بەم شێوە قبوڵ بکە کە چەند کەم دە زانی) بەڵام ئەم ڕەوشە لەجێی خۆیدا بەبڕوا هەبوون بە تایبەتمەندی رۆشنی حەقیقەت و شێوەیەکی نوێ لە بڕوا بەخۆبوون کە لۆسەر[3]و کالڤین[4]، بێکۆن و دێکارت بوونە بەرجەستەکەریو گوتوویانەتەوە.

---

[2] Erasme (1469 – 1536)، مرۆڤ دۆستی هۆڵەندی، نوسەری کتێبی بەناوبانگی ستایشی شێتیەتی– وەرگێڕی فارسی.

[3] Martin Luther (1483 – 1546) زانای ئیسلامی و چاکسازی ئایینی ئەڵمانی – وەرگێڕێ فارسی

[4] Jean calvin (1509 – 1564) چاکسازی ئایینی فەرەنسی، لایەنگری ئەندێشەی لۆسەر، وەرگێڕێ فارسی.



لەم ڕووەوە وورد بوونەوە لە جیاوازی نێوان گومانی دیکارتیو گومانی سوقرات یان گومانی ئێراسم و هۆنتۆنی[5] زۆر گرنگە. سوقرات، تێگەیشتن یان زانایی مرۆیی دەباتە ژێر پرسیارو پێ لەسەر رەتکردنەوەی هەرچەشنە لافی تێگەیشتنێ یان زانایییەك دادەگرێ، لە کاتێکدا دیکارت لەهەموو شتێك بەگومانە بەڵام تەنیا بۆ گەیشتن بە تێگەیشتنێکی تەواو یەکلاکەرەوە دەست بۆ ئەم کارە دەبا، چونکە لەوە تێدەگا کە زیادە ڕۆیی لە گوماندا، وای لێدەکات کە حەقیقەتی خواوەند بخاتە ژێر پرسیارەوە کە بێ مانایە. دیکارت دوای ئەوەی سەلماندی کە شك و گومانی گشتگیر بێ مانایە، بەو ئاکامە دەگا کە ئێمە دەتوانین بڕوا بە ناسین (زانین) بکەین، دەتوانین زانابین بەو مەرجەی کە بە هاوکاری روناکی سروشتی ئەقڵ، ئەندێشە ڕۆشن و دیاریکراوو سروشتیەکانی خواوەند لە ئەندێشەکانی تر کە لە خەونو خەیاڵی چەپەڵی ئێمەوە سەرچاوەیانگرتووە، جیاکەینەوە.

---

[5] michel montaigne (1533 – 1592) نووسەری فەرەنسی، وەرگێڕێ فەرەنسی





بەم جۆرە گومانی دیکارتی جیا لە ئامرازێکی سادە بۆ مامانی شتێکی دیکە نیە، کە وەك پێوانەی هەڵسەنگاندنی حەقیقەت کەڵکی لێوەردەگیرێو لە ئەنجامدا شێوازێکە کە دەتوانێ زەمانەتی تێگەیشتن و زانایی ئێمە بکات. بەڵام لەڕوانگەی سوقراتەوە( لە ئەپۆلۆجیادا ) زانایی، هۆشیاری مرۆڤە لەسەر خۆی، زانایی مرۆڤە لەسەر ئەوەی کە چەنێك کەمزانە. نیکۆلاس دی کۆس[6] و ئێراسم(کە پشت بە سوقرات دەبەستێ) سەرلەنوێ دەچێتەوە سەر رێبازی هەڵەکاری ریشەیی مرۆڤ و لەسەر بنەمای ئەم رێبازە(مرۆڤ دۆستانەیە(بە پێچەوانەی رێبازی گەشبینانەی پێویستی سەرکەوتنی هەق کە ملتۆن وەك بنەما لەبەرچاوی گرتبوو) نیکۆلاس دی کۆس و ئێراسم، هۆنتۆنیو جۆن لوك و ڤۆلتێر[7] بەدوای ئەوانیش جۆن ستوارت مێل و بیرتراند

[6] nicolas de cues(یان لە ئەسڵدا: nikolaus krebs) (1464 – 1401) پیاوی ئایینی ئەڵمانی، پشتیوانی پاپاکان و ئەوەی کە ئەوان هەڵە ناکەن، وەرگێڕی فارسی.)

[7] voltaire (1694 – 1778)، نووسەری فەرەنسی، وەرگێڕی فارسی.



ڕاسێڵ بناغەی رێبازی نەرم ونیانی نواندنی خۆیان داڕشت. ڤۆلتێر لە فەرهەنگە فەلسەفیەکەی خۆیدا ئەم پرسیارە دێنێتە ئاراوە: (نەرمی نواندن یانی چی؟) هەر خۆشی وەڵامدەداتەوە: "نەرمی نواندن تاییبەتە بە مرۆڤەوە. ئێمە لە تەوقی سەرەوە تا نووکی پێ بێ تواناو هەڵەین، با لە گەمژەییەکانی یەکتر خۆشبین، ئەمە یەکەم یاسای سروشتە" لەم دواییانەدا، رێبازی هەڵەکاری مرۆڤیان بە بنەمای تیۆری ئازادی سیاسی واتە ڕزگاری لە زۆر و گوشار، زانیوە[8].

## (11)

بێکۆن و دیکارت لە روانین و ئەقڵ دەسەڵاتگەلێکی نوێیان دروستکردووە، کە لە تەواوی مرۆڤەکاندا هەیە، بەڵام بەم کارەیان خودی هەموو مرۆڤێکیان کردۆتە دوو بەشەوە، سەرچاوەیەکی باڵاتریان لەودا پێکهێناوە کە دەسەڵاتەکەی لەمەڕ حەقیقەتە – بیکۆن ئەم سەرچاوەیە بە روانین (بینین)و

[8] Cf. F. A.Hayek. The constiution of Liberty. Londres, Routiedge,1960, pp. 22 et 29





دیکارت بە هۆشیاری(شعور) ناو دەبا– و سەرچاوەیەکی نزمتر کە پێکهێنەری زاتی هاوبەشی تەواوی مرۆڤەکانە یان هەمان مرۆڤی کۆنە کە لە ناخی ئێمەدا جێگیرە. لەبەر ئەوەی کە حەقیقەت رۆشن و ئاشکرایە هەمیشە ئەوە(ئێمە)ین کە لە ئاست هەڵەکاندا بەر پرسیارین. هەڵە بەرئەنجامی حوکمدانە پێشوەختەکانمانە، هەروەها بەرئەنجامی خەمساردی و کەلەرەقیەکانمانە. ئێمە خۆمان، سەرچاوەی نەزانی خۆمانین.

به گوێرەی ئەمە ئێمە دابەش بووین بەسەر دووبەشدا: بەشی مرۆیی کە بریتیە لە خۆمان، سەرچاوەی بیروبڕواکانمان کە دەشێ هەڵەبن(oloxa)، هەڵەکان و نەزانینەکانمان، بەشی سەرومرۆیی کە بریتیە لە هەستەکان یان هۆشیاری(شعرو)مان، سەرچاوەی تێگەیشتنی (زانین)ی راستەقینەی مرۆڤ (episteme)، کە دەسەڵاتی شێوە خواوەندی بەسەرماندا دەسەپێنێت.بەڵام مەسەلەیەك دێتە ئاراوە. لە راستیدا ئێمە دەزانین فیزیای دیکارت، کە لە چەندین ڕووەوە  نائاساییە، لە بنچینەدا هەڵە بوو، لە



خەیاڵاتێکەوە سەرچاوەی گرتبوو کە بە بڕوای دیکارت روون و ئاشکرا بوون، هەر بۆیە وەك پێویست ڕاستی لەخۆ دەگرت ، بەڵام بیرمەندانی سەردەمانی کۆن تەنانەت بەر لە پارامینیدسیش لەوە ئاگادار بوون کە نابێ لە هەستەکان، وەك سەرچاوەی  زانین بێخەمبین:بۆ وێنە گزنفۆن و هیاکلیت، و بە دڵنیایەوە دیموکریتیش لەوە بەئاگابوون.

سەیرە، ئەزموون گەراکانی ئەمڕۆ، بۆ وێنە ڕوواڵەت خوازان (فینۆمینالیستەکان)و پۆزیتیڤیزمەکان هیچ گوێیان نەداوەتە ئەم رێنوێنیانەو لە زۆربەی ئەو مەسەلانەی هێناویانەتە گۆڕێ، هەروەها ئەو ڕێگاچارانەی کە پیشانیانداوە. ئاماژەیان پێ نەکردووە، هۆکاری ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کە ئەم بیرمەندانە لەو بڕوایەدان کە هەستەکانمان هەڵە ناکەن بەڵکو ئەوە(ئێمە خۆمان)ین، کە کاتێك ئەوەی کە هەستەکان بە ئێمەیان (داوە) لێکی دەدەینەوە بە هەڵەدا ئەچین. هەستەکانمان حەقیقەت دەڵێن. بەڵام ئێمە، کە دەمانەوێ لە قسەو باسدا ئەمەی کە هەستەکان پێمان دەڵێن بیلێینەوە – زمانی دەستکرد، کە

دروســـتكراوی مرۆڤـــەو نارۆشـــنە– تووشـــی هەڵـــدەبین. دەربڕینی ئێمە لە ڕێگای زمانەوە، هەڵەکارە چونکە دەتوانێ تێکەڵ بە حوکمدانە پێشوەختەکان بێت.

بەم جۆرە دەکرێ هەڵە زمانی مرۆیی ئێمە بگرێتەوە، بەڵام هەروەك بینیمان، زمان بە ئێمە(دراوە) بەڵام ئەوەش رۆشـنەکە زانـایی‌و ئەزموونـەکانی چـەندین وەچـەیی لـە هەناودایەو، نابێ ئێمە ئەگەری ناکارامەیی خۆمان لە کەڵك وەرگرتنی دروست لە زمان بخەینە ئەستۆی زمانەوە. بە پێی ئەمە زمانیش، بۆتە سەرچاوەیەکی دەسەڵات و لە بەر ئەوەی حەقیقەتە ناتوانێ ئێمە فریو بدات. ئەگەر هانبدرێن و زمان بە هەند وەرنەگرین، ئێمە خۆمان هۆکاری ئەو گیروگرفتانە دەبین کە بۆمان دێنە پێش. چونکە زمان، خوایەکی چاوچنۆکە، هەر کەسێك بە هەندی وەرنەگرێ بێ سزای ناهێڵێتەوە بەڵکو بە قووڵایی تاریکییەکان و سەرلێشێواویەکاندا دەیباتە خوارەوە.

لەبەر ئەوەی ئێمە خۆمان و زمانەکەشمان(یان کەڵك لێوەرگرتنی نادروستی زمان لەلایەن ئێمەوە) ئەم



بەرپرسیارێتیەمان لەسەر شانە، ئەوا پێگەی دەسەڵاتێکی خواوەندئاسا بۆ هەستەکان(تەنانەت بۆ خودی زمانیش) دەبێتە شتێکی شیاو، بەڵام ئەم کارە تەنیا بەنرخی زۆرتر بوونی مەودای نێوان دەسەڵات و خودی ئێمە، نێوان دەسەڵاتی ناسینێك(تێگەیشتنێك) کە سەرچاوە پاکەکان، لە حەقیقەتی ژنە خواوەندی سروشتەوە پێیمانی دەداو لەگەڵ خودی ئێمە کە ناپاکانێکی تاوانبارین، نێوان خواوەندو مرۆڤ بە ئەنجام دەگات. هەر وەك ئاماژەم پێدا بیرۆکەی راستبوونی سروشت، کەمن لە بیکۆندا بینیومە، لە یۆنانیەکانەوە هاتووە، بەشێکە لە دژایەتی نێوان سروشت و رێکەوتنامەی مرۆیی کە، ئەگەر ووتەی ئەفلاتوونمان بەلاوە پەسەند بێت، سەرچاوەکەی (پیندرای)[1] یەو، دەتوانرێ لەلای پارمێنیدسیش ببیندرێ و ئەو خۆشی وەك برێك لە سۆفیستەکان (وەك هیپیۆس)[2] و تارادەیەك خودی

[1] Pindare (488 – 518 بەر لە زایین)، شاعیری یۆنانی، وەرگێڕی فارسی.

[2] Hippias (سەدەی پێنجی بەر لە زایین)، فەیلەسووفی سۆفیستی یۆنانی، وەرگێڕی فارسی.





ئەفلاتوون، بە لێکدژی نێوان حەقیقەتی ئیلاهیو ناراست، بۆ وێنە هەڵەی مرۆڤی، دەشوبهێنێ. پاش بێکۆن و، لە ژێر کاریگەری ئەودا، ئەم خەیاڵە کە سروشت تایبەتمەندیەتی خواوەندی هەیەو، حەقیقەتەو، هەروەها ئەو بیرکردنەوەش کە سەرچاوەی هەر چەشنە هەڵەیەكو هەرچەشنە ناراستیەك، تایبەتمەندی فریودەرانەی ڕێککەوتننامە مرۆییەکانە، نەك تەنیا لە مێژووی فەلسەفەو زانست و بیری سیاسیدا، بەڵکو لە مێژووی هونەرە بینراوەکانیشدا[3] هەمیشە ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەی گێڕاوە. بۆ نموونە لەو ڕوانگە زۆر سەرنج ڕاکێشانەی کە کۆنستابێل[4] سەبارەت بە سروشت، حەقیقەت، حوکمدانە پێشوەختەکان و، ڕێککەوتننامەکان، دەریبڕیوەو گامبرێچ[5] لە کتێبی هونەرو

3. visuelle

4 John constable (1776 – 1837) وێنەکێشی ئینگلیزی، وەرگێڕی فارسی.

5 Ernst hons Gombrich (1909– )، مێژوو نووسی هونەر، بەریتانیاییەکی بە ڕەچەڵەك نەمسایییە، وەرگێڕی فارسی.



تەوەهومی[6] خۆیدا باسیکردووە، ئەم فیکرە دەبینرێ. هەروەها ئەم فکرە کاریگەری لە مێژووی ئەدەبیات و تەنانەت لە مێژووی مۆسیقاشدا هەبووە.

## (12)

ئایا دەکرێ ئەم بۆ چوونە سەرسوڕهێنەرە کە بەیارمەتی لێکۆڵینەوەی سەرچاوەکانی -واتە گەڕان بە دوای سەرچاوەکانی-دەربڕینێکدا حەقیقەتی ئەو دەربڕینە ئاشکرا دەبێ، بە شك و گومانێك بزانین کە دەکرێ نەمێنن؟ یان ناچارین کە بە سەرنجدان لەو تێبینیانەی کە پەیوەندیان بە بیروبڕوا ئاینیەکان یان دەروونناسیەکانەوە هەیە، وەك کاریگەری دەسەڵاتی دایك و باوك، لێی

6. Cf. Notamment, dans Louvrage cite (E. H. Gombrich. L'Art et L' I llusion, Paris, Gallimard, 1971, trad, G.Durand), Les Premier et dernier chapitres.(یاداشتی وەرگێڕی فەرەنسی)





بکۆڵینەوە؟ من پێموایە لەم بوارەدا هەڵەیەکی لۆژیکی لە ئارادایە کە لە وێك چوونێکی زۆری نێوان واتای وشەکان، دەستەواژەکان، یان ئەو چەمکانەی کە بە کاریان دێنین، لەگەڵ حەقیقەتی راپۆرتەکان یان ئەو ڕستانەی کە دایاندەڕێژین، سەرچاوە دەگرێ، (سەیری خشتەی لاپەڕەی 59ی ئەم کتێبە بکەن[1]).

زۆر ئاشکرایە لەنێوان واتای ئەو وشانەی کە کەڵکیان لێوەردەگرین و مێژووەکانیان پەیوەندییەك هەیە. لە روانگەی لۆژیکیەوە، دەستەواژە، هێمایەکە کە لەسەری رێککەوتوون و، لەروانگەی دەرووناسییەوە هێمایەکە کە واتاکەی بەهۆی بەکارهێنان، نەریت، یان پەیوەندییە

[1] ئەم خشتەیەی، کە بۆ یەکەم جار لێرەدا بەکارهاتووە، پۆپەر لە شوێنە جۆرو جۆرەکاندا بەکاریهێناوە، بە تایبەتی لە کتێبی:

objiective Knowledge An Evo lutionary Approach. Oxford clarendon Press 1972 PP.124 et 310.

هەروەها لە کتێبی بەدواداگەڕانێکی ناتەواویشدا بەکاریهێناوە

La Quete inachevee, paris, calmann. Lovy, 1981 (trad. M. Bouin- Nudin et R. Bou- ver- esse), P. 36



گشتیەکانەوە چەسپاوە. لە بواری لۆژیکیەوە، واتای وشە، بەمەبەستێکی لە پێشداو، لەگەڵ یەکەمین پۆلێن یان پەیماندا، لەگەڵ جۆرێك پەیمانی کۆمەڵایەتی سەرەتاییدا دیاریکراوە. دەکرێ بڵێین کە لە ڕووی دەرووناسییەوە مانا کاتێك دەچەسپێ کە مرۆڤ بۆ یەکەم جار بەکارهێنانی وشە فێر دەبێ، ئەو کاتەی کە نەریت و پەیوەندییە زمانییەکان دروستدەبن، کەواتە قوتابییە کەمتەمەنە بەریتانیەکان لەلایەنێکەوە هەقیانە گلەیی لە نائاسایی بوونی زمانی فەرەنسی دەکەن و دەڵێن لەو زمانەدا بەنان (Bread) دەوترێ: (پایین) (pein)کە بە ئینگلیزی یانی(ئازار)و لە کاتێکدا کە زمانی ئینگلیزی لە روانگەی ئەوانەوە زۆر سروشتیو ئاساییە چونکە لەم زمانەدا بەنان دەڵێن (نان)و بە ئازار (ئازار). هەڵبەت قوتابیە ئینگلیزیی زمانەکان دەتوانن زۆر باش درك بە ڕۆڵی رێککەوتن لە بەکارهێنانی وشەکان بکەن، بەڵام وەك دەڵێن نیگەرانی ئەوان لەو ڕووەوەیە کە بۆ دەبێ ئەو پەیمانە سەرەتاییانە (سەرەتایی لە روانگەی ئەوانەوە) بۆ هەموان زۆرەملێ نەبێ. هەڵەی ئەوان لەوەدایە





کە تێناگەن ڕەنگە بڕیارنامە سەرەتاییەکان هەمە جۆرو هەمووشیان وەك یەك پێویستبن. بەڵام کێ هەیە کە لانی کەم بەشێوەیەکی لابەلا تووشی ئەم جۆرە هەڵانە نەبووبێت؟ ئایا ئێمە زۆربەمان کاتێك دەبینین لە فەرەنسادا تەنانەت منداڵەکانیش بە ئاسانی بەزمانی فەرەنسی قسە دەکەن راناچەنیین؟ بە دڵنیاییەوە پێکەنیمان بە گێلیەتی خۆمان دێت. بەڵام هەرگیز بیر لە پاسەوانێك ناکەینەوە کە پێکەنینیدێ بەوەی کە تیدەگات ناوی راستی سامۆئێل جۆنز لە راستیدا جۆن ئیسمیتەو، لە کاتێکدا کە لە م بوارەدا پاشماوەیەك لەو بڕوا جادوویە لە ئارادایە کە هەرکات ناوی راستی خواوەند یان دەرونی مردوویەکمان زانی بەسەرییدا زاڵ دەبین: بە ووتنی ناوی ئەو دەسەڵاتە خواییە دەتوانین دەستەوداوێنی بین و داوای لێبکەین پشتیوانمان بێت.

هەمووان وا بیردەکەنەوە کە واتای (حەقیقی) یان واتای (تایبەتی) وشەیەك یەکەم واتای ئەو وشەیەیە. هەر بۆیە دەکرێ لە بواری لۆژیکیشەوە بیسەلمێنین. ئێمە لە واتایەك تێدەگەین چونکە بە دروستی فێری بووین –



لەسەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە (دەسەڵاتێك)، لە کەسێکەوە کە لە زمان شارەزایە– فێری بووین، ئەمە دەری دەخا کە بە دڵنیاییەوە مەسەلەی واتای وشەکان پەیوەندی بەمەسەلەی سەرچاوەکانی دەسەڵات و، یان مەسەلەی سەرچاوە کار کردیەکانەوە هەیە کە ئێمە لەگەڵیدا هاو ئاهەنگین.

دەشێ لەسەر حەقیقەتی دەربڕینێ یان ڕستەیەك مەسەلەکە بەم جۆرە نەبێت. لە راستیدا لەهەموو کەس روودەدات، تەنانەت لەو مەسەلانەدا کە وەك باوە و دەبێ حوکمدانەکەی جێگای بڕوابێت، وەك ووتی تەمەنەکەی خۆی، یان دیاریکردنی شتێك کە هەر ئێستا بەڕوون و ئاشکرایی بینیوویەتی، هەڵە بکات. ڕەنگە بنچینەی دەربڕینێك لە کاتی داڕشتنیدا تەواو ناراست بێت بەڵام هەر لەو سەرەتایەوە بە دروست بزانرێ، بە پێچەوانەوە، ئەگەر بەدروستی وشەیەك تێبگەیەندرێ، وەك پێویست مانای تایبەتی خۆی هەیە.بەم پێیە ئەگەر لەمەڕ شێوەی سپاردنی واتای وشەکان‌و، حەقیقەتی دەربڕینەکان





www.pertwk.com

بەسەرچاوەکانیانو، سەبارەت بە دژایەتی نێوان ئەم دوو پرۆسەیە رامێنین ئیتر وا بیرناکەینەوە کە ڕەنگە مەسەلەی بنەماو سەرچاوە کاریگەریەکی گرنگی لەسەر مەسەلەی ناسین یان حەقیقەت هەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا، واتاو راستی (حەقیقەت) زۆر وەك یەك وان، و چەمکێکی فەلسەفی هەیە- من (گەوهەرگەرایی)[2] پێ دەڵێم- کە دەیەوێ واتاو راستی وەها توند پێکەوە گرێ بدات کە ئیتر نەتوانرێ ئەم دوو توخمە چونیەك نەزانرێت. بۆ ئەوەی کورتو پوخت کێشەو گیروگرفتەکان روونکەینەوە، سەرلەنوێ دەگەڕێینەوە بۆ

[2] پۆپەر پێشترو لە هەموو بەهەرمەکانیدا ئەم دەستەواژەیەی (essentialisme) بەکارهێناوە، بەڵام وادیارە دەبێ دوهێم (Duhen) بە داهێنەری ئەم وشەیە بزانین کە ئەو وشەیەی لە کتێبێکی خۆیدا بەناوی(systeme du monde)(نیزامی جیهان)، بۆ وەسفکردنی قوتابخانەی سکۆتی(قوتابخانەی فەلسەفی Duns scot، زانای خواناسی سکۆتلەندی) فرانس ڤۆن مایرۆنی (Meyroni Franz von کە لە ساڵی 1329 زاییینیدا کۆچیکردووە) و نیکۆلاس بۆنت(Bonet nicolas کۆچکردوو لە ساڵی 1360 زاینییدا) ئەم وشەیەی بەکارهێناوە،(پییر دوهێم خۆی فەیلەسوفێکی فەرەنسییە (1916 – 1861) کە بڵاوکەرەوەی ئەبستمۆلۆژی لەسەر بنەمای مێژووی زانستەکان بووە – وەرگێڕی فارسی).



خشتەی ئەندێشەکان، لەگەڵ ئەوەدا کە پەیوەندی نێوان دوو ریزەکەش لە بیر ناکەین.

پەیوەندی دووبەشی خشتەکە لەگەڵ یەکدا چۆنە؟ لە ستوونی چەپدا "پێناسەکان" دەبینین. بەڵام پێناسە، جۆرە دەربڕین، حوکمدان، یان ڕستەیەکە، هەر بۆیە لە جۆری هەمان ئەو توخمانەیە کە لە ستوونی ڕاستدا دەبیندرێ. هەڵبەت ئەم بابەتە رەوشی لێك نزیکی خشتە داڕێژراوەکە تێك نادات چونکە خودی بازنەی کرداری جیابوونەوەکانیش خۆی لە چوارچێوەی جۆرە توخمگەلێك-دەربڕینەکان و ، هتد دا- لە ستونێکدا، باسکراوە کە جیابوونەوەکانی تێدایە. هەر بەو شێوەیەی کە زۆرتر پێناسە کردنێك بە یارمەتی تێکەڵاوی وشەگەلێك بە ناوەرۆکی تایبەتەوە بەیان دەکرێ هەتا بە وشەیەك، هەر جیا بوونەوەیەکیش بە جۆرێکی تایبەتی لە تێکەڵاوی دەربڕینەکان دا دەرێژرێ نەك بە دەربڕینێك.و رەوشی دەربڕینی ئاسایی پێناسە باسکراوەکان لە ستوونی چەپدا پیشانی دەدا کە ئەم پێناسەکردنانە بە جۆرێك لە جۆرەکانی دەتوانێ پەیوەندیدەری نێوان دوو دوو ستوونی خشتەکە بێت.





ئەندێشەکان بەواتای

دەربڕینەکان    هێماکان

رستەکان    عیبارەتەکان (دەستەواژەکان)

یان تیۆریەکان    یان چەمکەکان

دەتوانن بە شێوەی

پەسەنکردنەکان    وشەکان

بوترێن بە گریمانەی

راست بوون    مانادار بوونیان

و

حەقیقەتی    واتای

دەشێ ئەوان بە یارمەتی

جیابوونەوەکان (موشتەقاتەکان)    پێناسەکان

بە

بەڕستە گەلێکی سەرەتایی    چەمکگەلێکی ناڕۆشن

کۆتایی بێت

---

ئەگەر بمانەوێ بەم جۆرە (زوتر لەوەی کەلەرێگای نەهێشتن و کەم کردنەوە مەیسەرە)

حەقیقەتێك    واتایەك



بۆ ئەوان دیاری بکەین

بەدوادا چوون یان گەڕانەوە بۆ دواوە کۆتایی نایات

ئەو رێبازە فەلسەفیەی کە من ناوم ناوە (گەوهەرگەرایی) سەلمێنەری رۆڵی پێناسەکانە، لە راستیدا بەپێی ئەم تیۆرەیە بەتایبەتی گێڕانەوە ئەرەستۆییەکەی) هەر پێناسەیەك، دەربڕی جەوهەر یان ناوەرۆکی شتێکە، بەڵام هەر لەو کاتەدا واتای وشەیەکیش– کەناوەکەی جەوهەرە– دیاری دەکا. (لەروانگەی دیکارت و کانتیشەوە (جەستە پیشاندەری شتێکە کە پانتایی، جەوهەری ئەو شتەیە).

ئا لەو کاتەدا ئەرەستۆ وەك فەیلەسوفە گەوهەرگەراکانی تر لەو بڕوایە دا بوو کەپێناسەکردنەکان بریتین لە ((بنەماکان)) واتە بریتین لەو ڕستە سەرەتاییانەی (وەك ڕستەی: (تەواوی جەستەکان پانتایین) کە لە رستەکانی دیکەوە وەرنەگیراوە سەرجەمی یان بەشێکی ماهیەتی تەواوی بەڵگەهێنانەوەکان پێکدەهێنێ، هەر بۆیە بناغەی تەواوی زانستەکان و، پێناسەکردنەکانە. بێگومان دەبێ ئەوەمان بیر نەچێ کە هەر چەندە دواین ڕەگەزی ئەم تیۆرە،





یەکێکە لە بەشە گرنگەکانی بنەماکانی گەوهەرگەرایی، پشتی بەهیچ جەوهەرێك نەبەستووە. ئەمە دەری دەخا کە فۆمینالیستەکانی نەیاری تیۆری ماهیەتەگەرایی وەك هۆبز[3]، یان شلیك[4]، توانیویانە ئەم تیۆرەیە پەسەند بکەن.

وا دیارە ئێستا دەتوانین بەرۆشنی لۆژیکی دەروونی چەمکێك بەتەواوی روونکەینەوە کەمەسەلە پەیوەندیدارەکان بە بنەماو سەرچاوە بۆ چارەسەری کێشەکانی پەیوەندیدار بە حەقیقەتی جێکەوتوو(واقع) دەزانێ. لە ڕاستیدا ئەگەر بنەماو سەرچاوەیەکی تاقانە بتوانێ واتای ڕاستەقینەی وشە یان دەستەواژەیەك دیاریبکات دەتوانێ پێناسەی ڕاستەقینەی چەمکێکی گرنگیش دەستەبەر بکات، هەر بۆیە لانی کەم بەشێك لە (بنەماکان) کە پێناسەی ماهیەت یان ناوەرۆکی شتەکان و،

[3] Thomas Hobbes (1588 – 1679)، فەیلەسوفی ئینگلیزی، وەرگێڕی فارسی.

[4] moritz schlick (1882 – 1936)، لۆژیکزانی ئەڵمانی لە قوتابخانەی (neo positivisme)، وەرگێڕی فارسی.



بەو پێیەش بناغەی بەڵگەهێنانەوەکان و، لە ئەنجامدا ناسینی زانستیانەی ئێمەیە، دیاری بکات. سەرئەنجام ئەوەی کەچەند سەرچاوە یەکی ناسین بوونیان هەیە کە جێگای بروان.

بەڵام دەبێ بەباشی لەو خاڵە تێبگەین کە ئەگەر چەمکی جەوهەرگەرایی، پێدا گری ئەوە بێت کە پێناسەکان دەتوانن ناسینی زانسیانەی ئێمە زیاد بکەن هەڵەیە (تەنانەت ئەگەر ناسینی زانستیانە بتوانێ کاریگەری لەسەر جەوهەر گەرایی هەبێ، لەو رووەوەکە هەردووکیان بە بڕیارەکانەوە وا بەستەن و، تەنانەت ئەگەر پێناسەکان ببنە ئامرازێك و بتوانن کاریگەری لەسەر شکڵگرتنی تیۆرەکان و لە ئاکامدا لەسەر گۆڕانکاری ناسینی ئێمە، دابێن). هەر کات لەوە تێبگەین کە هەرگیز پۆلێنکردنەکان نابنە هۆی ناسینی ڕاستەقینەی (سروشتی شتەکان) خاڵی لاوازی ئەو پەیوەندیە لۆژیکیەش کە گروپێك لە فەیلەسوفە جەوهەرگەراکان هەوڵیانداوە لە نێوان مەسەلەی سەرچاوەو مەسەلەی حەقیقەتی جێکەوتوو (واقع)دا پێکبهێنن، بۆ دەردەکەوێ.





**(13)**

ئێستا ئیتر واز لە تێڕامانە مێژووییەکان دێنین و سەرقاڵی مەسەلەو ڕێگاچارەکانیان دەبین.

ئەم بەشەی قسەکانمان ڕەخنەیە لە ئەزموونگەریی کە بۆ نموونە، هیوم بە شێوەی کلاسیك بەم جۆرەی باسی دەکات: ((ئەگەر لێت بپرسم بۆچی بڕوات بە مەسەلەیەکە[..]دەبێ بەڵگەم بۆ بهێنیتەوە، ئەم بەڵگەیەش مەسەلەیەك دەبێ کە پەیوەندی بەمەسەلەی یەکەمەوە هەیە، بەڵام لەبەرئەوەی ناتوانی لەڕادەیخۆی زیاتر[1] درێژە بەم کارە بدەی، سەرەنجام دەبێ پشت بە هەستەکانت یان بە مەسەلەیەك ببەستی کە لە بیرەوەریتدایە، ئەگینا بڕواکانتان تەواو بێ بناغەن[2]))..

1. in infinitum
2. Enquetes sur L'entendement humain ,Paris, Aubier, 1977, (trad, A. Leroy), section V, Premiere partie. P. 92; cf. Egalement l'exergue emprunte a la section VII, deuxieme partie, pp. 108 - 109.



بە گشتی گرفتی ئیعتباری ئەزموونگەرایی دەکرێ بەم جۆرە ڕیزبەندی بکرێ: ئایا بینین، دوایین سەرچاوەی زانایی ئێمەیە سەبارەت بە سروشت؟ ئەگەر وەڵامەکەی نیگەتیڤە، ئەی سەرچاوەکانی زانینی ئێمە چین؟

لە ڕاستیدا بەدەر لەو شتانەی کە ئاماژەم پێکردن و، تەنانەت لە حاڵەتێکدا کە لێکدانەوەکانی من لە بواری بڕێك لە خاڵەکانی فەلسەفەی بێکۆن تەوانیبێتی تا ڕادەیەك(لایەنگرانی ئەم فەلسەفەو، هەروەها بیرمەندانی تری ئەزمونگەرا لەو خاڵانە بگێڕێتەوە، واش ئەو مەسەلانە هەروا لە ئارادایە.

پێش ئێستا، گرفتی سەرچاوەی ناسین، بەم شێوەیە بەیاندەکرا: کاتێك ئێمە حەقیقەتی شتێك دەسەلمێنین دەبێ بۆ سەلماندنەکەمان بەڵگەمان هەبێ، هەروەها دەبێ وەڵامی پرسیارگەلێکی لەم چەشنەش بدەینەوە:

(لە کوێوە ئەم مەسەلەیە دەزانی؟ ئەو سەرچاوانە کامانەن پشتگیری ئەم مەسەلەیە دەکەن؟) وەها پرسیارگەلێك لە ڕوانگەی ئەزموونگەرانەکانەوە وەك ئەوەیە





**بپرسین: (بنەمای لافلێدانەکەتان کام روانینانەن (یا چ روانین گەلێك بەبیری دێننەوە) ؟)و بەلاّم بەبڕوای من ئەم پرسیارە یەك لەدوای یەکانە قەناعەتپێکەر نین.**

**سەرەتا ئەوەی کە لاف وگەزافەکانمان، زۆرتر لەسەر بینین دانەمەزراون بەڵکو سەرچاوەگەلێکی جۆراو جۆری دیکە بناغەی ئەوانن، مەسەلەی "لە کوێوە دەزانی" ڕەنگە چەندین وەلاّمی رۆشنی، وەك((لە ئینسایکلۆپیدیای بەریتانیدا خوێندومەتەوە))ی هەبێ نەك وەلاّمگەلێکی وەك "بینوومە" یان "چونکە ساڵی پار بینیومە کەواتە دەیزانم..)).**

**ئەزموونگەرا وەلاّم دەداتەوە:**

**(بەلاّم بەبڕوای ئێوە، گۆڤاری تایمز یان ئینسکلۆ پیدیای بەریتانی ئەم زانیاریەی لە کوێوە هێناوە؟) بێگومان ئەگەر باش وورد ببینەوە دەگەینە بینینە یەکلاکەرەوەکانی ئەو شایەتانەی بەچاوی خۆیان دیویانە(ئەو بینینە حاشاهەڵنەگرانەی کە هەندێك جار "دەربڕینە بڕیارییەکان" یان بە گوێرەی وشەناسی ئێوە بە(دەربڕینە بناغەییەکان)**



**ناوی دەبەن، بەدڵنیاییەوە ئەزموونگەرا بەم جۆرە درێژەی پێدەدا کە بەشێکی زۆری هەر کتێبێك لە بەرهەمەکانی دیکەوە وەرگیراوە، بۆ نموونە هەر مێژوونووسێکیش سەروکاری لەگەڵ بەڵگەنامەیەکدا هەیە، بەلاّم سەرئەنجام شیعری لێبەدەر بێت، سەرچاوەی کتێبەکان یان بەڵگەنامەکانیش لەسەرەتاوە ئەو بینانەن کە نووسراونەتەوە، خەون و خەیاڵو تێکەڵەیەك لە قسەپووچەکان دەبن نەك شایەتی. بەم واتایەیە کە ئێمەی ئەزموونگەرا دەڵێین بەپێی پێویست بینین دوایین سەرچاوەی زانینە).**

**بەرگری کردن لە ئەزموونگەرایی بەم جۆرە ،کە کۆمەڵێك لە دۆست و ناسیاوەکانم لە قوتابخانەی پۆزیتیڤیستی هەروا رێزی لێدەگرن.**

**تێدەکۆشم ئەوە دەربخەم کە ئەم تیۆرەش ئیعتیبارێکی زۆر تری لە تیۆرەکەی بێکۆن نیەو، رێگاچارەی مەسەلەی سەرچاوەکانی ناسین، وەلاّمی ئەزموونگەرایانە نیەو لە ئەنجامدا ئەم جۆرە هێنانە گۆڕی مەسەلەکە، واتە لە رێگای**

دوایین سەرچاوەکان، – ئەو سەرچاوانەی کە ئیعتیبارەکەیان وەك حوکمێکی دادوەری یان رای سەرچاوەی دەسەڵاتێکی باڵاترە وە وەك بەڵگە بهێنرێتەوە – دەبێ رەت بکریێتەوە، چونکە پشتی بەهەڵە بەستووە. سەرەتا پیشانیدەدەم کە ئەگەر ئێمە درێژە بەم توێژینەوەیە بدەین و سەرچاوەکانی زانیاری گۆڤاری تایمزو نوێنەرەکانیان لەوان بپرسین، هەرگیز بەکردەوە ناگەینە شایەتی شاهیدعەیانەکان، کە جێگای پەسەندی ئەزموونگەراکانە. بە پێچەوانەوە دەبینین کە ناچارین لە هەر قۆناغێکدا هەروا درێژە بە لێکۆڵینەوەکە بدەین. بە دەربڕینێکی دیکە ئەمە حاڵەتی تۆپەڵە بەفرێك(کە هەر ساتەو گەورەترو گەورەتر دەبێ) بە خۆوە دەگرێ و مەسەلەکە ئاڵۆزتر دەبێ.

بۆ نموونە با مەسەلەیەك لەبەرچاو بگرین کە مرۆڤ بە شێوەیەکی لۆژیکیانە بەوەڵامی(لە تایمزدا خوێندوومەتەوەقبووڵی دەکات: ئەویش ئەوەی کە (سەرۆك وەزیر دەیەوێ گەڕانەوەکەی چەند رۆژ پێش خات.)) با



ساتێك بیر لەوە بکەینەوە کە کەسێك ئەم هەواڵە بخاتە ژێر پرسیارەوە، یان بەمەبەستی توێژینەوەیەکی تایبەت، وا هەست بکات پێویستە خۆی لەراستی هەواڵەکە بکۆڵینەوە. لەم حاڵەتەدا دەبێ چی بکات؟ ئەگەر ئەم کەسە لە خانووی ژمارە 10ی شەقامی داونینگ (شوێنی سەرۆك وەزیرانی ئینگلین)دا دۆستێکی هەبێ، باشترین و ئاسانترین رێگا ئەوەیە کە تەلەفۆن بکات بۆ دۆستەکەی و راستی هەواڵەکەی لێی بپرسێت هەتا لێکۆڵینەوەکەی بە ئەنجام بگات.

بەدەربڕینێکی تر، ئەم لێکۆڵیارە هەوڵئەدا لە جیاتی ئەوەی سەرچاوەی هەواڵەکەی دەستکەوێ، چەند بۆی بکرێ خۆی لە مەسەلەکە بکۆڵێتەوە. بەڵام لە ڕوانگەی ئەزموونگەراییە وە ڕستەی(لە تایمزدا خوێندوومەتەوە) قۆناغی یەکەمی پرۆسەی پاساودەرە بۆ گەیشتن بە دوایین سەرچاوە. کەواتە قۆناغی دوایی کامەیە؟

لانی کەم دوو شت ئیمکانی هەیە. یەکێکیان ئەوەی کە وای دابنێین رستەی(لە تایمزدا خوێندومەتەوە))و پڕوپاگەندەیەکە بزانین و بپرسین(چۆن ئەزانی لە تایمزدا

خوێندوتەتەوە نەك لە ڕۆژنامەیەكی تری وەك ئەودا؟) دووهەمیان ئەوەی كە سەرچاوەكانی ئەو هەواڵە لە تایمز بپرسین، ڕەنگە وەڵامی پرسیاری یەكەم بەم شێوە بێت:((تایمز تەنیا ڕۆژنامەیەكە بۆ مان دێ و سەر لە بەیانی هەموو ڕۆژێك بەدەستمان دەگات)) كە ئەم پرسیارە خۆی، لەسەر سەرچاوەكانی هەواڵ زنجیرە پرسیارێك دێنێتە ئاراوەو هەربۆیە لەوە زیاتر ناچینە پێش. ڕەنگە بەڕێوەبەری تایمز پرسیاری دووهەم بەم جۆرە وەڵامبداتەوە: (لە نووسینگەی سەرۆك وەزیرەوە تەلەفۆنیان بۆ كردین) بە بڕوای ئەزموونگەراكان، لەم قۆناغەدا بە پێی نەریت دەبێ بپرسین: ((كێ هەواڵەكەی وەرگرت؟))و پاشان سەبارەت بە ووردەكارییەكانی داوای ڕوونكردنەوە بكرێ. بەڵام لە هەمانكاتدا دەبێ بپرسین: ((لە كوێ ئەزانی ئەو دەنگەی كە بیستراوە بەڕاستی دەنگی یەكێك لە بەرپرسانی نوسینگەی سەرۆك وەزیران بووە؟))و هتد..

بەدڵنیاییەوە ئەم زنجیرە پرسیارە وەڕزكەرانەیە ئەنجامێكی دڵخۆشكەری لێناكەوێتەوە. هەر لەبەر ئەم هۆ



زۆر سادەیەیە كە: بەپێی نەریتی باو، ناسینێك كە بەڵگەی لە كەسەكان، شوێنەكان، شتەكان، شێوازەكانی قسەكردن، پەیمانە كۆمەڵایەتیەكانو هەتا دوایی هەیە، ڕۆڵێكی گرنگ بگێڕێ. شایەت ناتوانی تەنیا بەدەربڕینی هەست پێكراوەكانی خۆی، شتە بینراوو بیستراوەكان، قەناعەت بكات، بەتایبەتی ئەگەر بەڵێن وابێ ئەم ناسینە بۆ پاساوی ئیدیعایەك كەڵكی لێوەردەگیرێ كە وەك پێویست دەكا دەبێ قابیلی قبوڵ بێت. بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەو كات چەندین پرسیاری نوێ لەسەر سەرچاوەكانی پێگەكانی ناسین دێتە پێش كە ئاكامی ڕاستەوخۆی بینین نیە.

لەبەر ئەم هۆیە كاركردی بەرنامەیەك لەسەر بناغەی سپاردنی ناسین بە دوایین سەرچاوەكەی، كە گوایا لە بینین دایە، دەرخەری مەحاڵێكی لۆژیكیە: ئەم مەحاڵەش بە دواداڕۆشتنی ئەو زنجیرەیەیە تائەوپەڕی كۆتایی(ئامانج لە بنەمای تایبەتمەندی ڕۆشنی حەقیقەت بەتایبەت ئەوەیە ئەم شوێنكەوتنە لە جێیەكدا كۆتایی بێت، كارێك كە بۆ بەیانكردنی ئەو پێشوازیەی لەم تیۆرە كراوە، بێ كەڵك نیە.

هەروەها ئێستا پیشانیدەدەم کە ئەم ئەنجامگیریانە پەیوەندی بە چەندین بەڵگەوە هەیە کە دەیسەلمێنن: یان هەموو بینینێك پەیوەندی بە لێکدانەوەیەکەوە هەیە کە بەرهەمی روناکی تیشکی زانایی تیۆریە[3]،یان زانایی سەرچاوەگرتوو لە روانینە ئەبستراکتەکان و دابڕاو لە تیۆرەکان – گرێمان زانایییەکی لەو چەشنە هەبێ– تەواو نەزۆك و بێ کەڵکە.

لە پرۆگرامی قوتابخانەی رەسەنایەتی بینیندا، کە بەردەوام بەدوای دۆزینەوەی سەرچاوەکانی ناسینەوەیە، جیا لە وەرزکەریەکەی، شتێك کە بەرچاوە ئەوەیە ئەم پرۆگرامە بەهیچ جۆرێك لەگەڵ ئەقڵێکی تەندروستدا نایەتەوە. بە کردەوە هەرکات گومان لە ئیدیعایەك بکرێ مرۆڤ خۆی هەڵدەستێ بە تاقیکردنەوەی ئەو ئیدیعایەو کاری بە سەرچاوەکانی نیەو، ئەگەر توانی پشت راستی

[3]. CF. Ibid, section 24, dernier aliena, et le nouvel appendice; X.2.



کاتەوە ئەوا زۆرتر ئەو ئیدیعایە قبوڵ دەکا بەبێ ئەوەی هەرگیز دوای سەرچاوەکانی بکەوێ.

بێگومان لە هەندێ بواردا، مەسەلەکە بە شێوەیەکی ترە. واوەتر ڕۆیشتن تا سەرچاوەکان بۆ تاقیکردنەوەی ڕاپۆرتی مێژوویی پێویستیەکی هەمیشەیە، بەڵام نەك هەمیشییە، تا گەیشتن بە شایەتی ئەو شایەتانەی بە چاوی خۆیان دیویانە. روون و ئاشکرایە هیچ مێژوونووسێك بەبێ تاقیکردنەوەیەکی رەخنەییانە بەڵگەنامەکان قبوڵ ناکات. ئەم تاقیکردنەوەیەڕووبە رووی مەسەلەگەلێك دەبێتەوە کە پەیوەندی بە رەسەنایەتی بەڵگەنامەکان و روانگەکانەوە هەیەو، لەم نێوەدا گرفتی نۆژەنی سەرچاوە کۆنەکانیش دێتە ئاراوە. هەروەها چەندین پرسیاری وەك: ئایا نووسەر لە کاتی رووداوەکەدا خۆی لەوێ بووە؟ ئەویش دێتە ئاراوە. بەڵام ئەم جۆرە پرسیارانە تەنها کاری ، مێژوو نووس نیە. ئەو دەیەوێ بزانێ کە ئایا دەکرێ متمانەمان بە پەیوەندییەك هەبێ یان نا. بەڵام کەمتر شتی وا روودەدات کە بپرسێ ئایا ڕێکخەری بەڵگە نامەکە خۆی، ئەو رووداوەی کە





له ژێر لێکۆڵینەوەدایە– گریمان دەبینرا– بە چاو بینیویەتی یان نا. نامەیەك كە تیایدا نووسراوە(من دوێنێ رام لەسەر ئەم بابەتە گۆڕیوە) دەتوانێ بەڵگەیەکی جێگای بروا بێت کە بایەخێکی مێژوویی زۆر گەورەی هەبێ، هەرچەندە ڕاگۆڕین شتێك نیە ببینرێ.(تەنانەت ئەگەر بەڵگە نامە گەلێکی دیکە ناچارمان کات ئەو گریمانەیە وەرگرین کە نووسەر درۆیکردوە).

بەڵام ئەو شایەتانەی بە چاوی خۆیان بینیویانە زۆربە جیا لە ڕەوتی دادوەری،کە لێپێچانەوەی بەرامبەری‌تیا بەڕێوەدەچێ،دەورێکی وانابینین.وەك زۆربەی پارێزەرەکان دەزانن کە زۆرجار شایەتە عەینیەکان بەهەڵەدا دەچن.سەبارەت بەم دیاردەیە لێکۆڵینەوەی ئەزموونگەرانەی زۆر بەڕێوە چووە و دەرئەنجامی سەرسوڕهێنەری لێکەوتۆتەوە.تەنانەت ئەو شایەتانەی کە بۆ شیکاری ڕووداوێك بەهەمان شێوە کە ڕویداوە ئەوپەڕی وردبینی بەکار دێنن لەوانەیە تووشی هەڵەی زۆر بێن،بەتایبەت ئەگەر ڕووداوگەلێکی سەرنج ڕاکێش،بەلەز و یەك لەدوای یەك ڕوو



بدات و ئەگەر ڕووداوێك لێکدانەوەیێکی ختووکەدەرانە بخوازێ زۆرکات ناکرێ‌بەر بەوە بگێردرێ کە ئەم لێکدانەوەیە ئەو شتە نەگۆڕێ کە لە ڕاستیدا بیندراوە. هیوم ڕوانگەیەکی دیکەی لەسەر زانایی(ناسینی) مێژوویی هەیە. ئەو لە کتێبەکەیدا دەنووسێ[4]: (ئێمە هەموومان بڕوامان بەوە هەیە کە قەیسەر ڕۆژی 15ی مانگی مارس لە ئەنجومەنی پیراندا کوژرا، چونکە تەواوی مێژوونووسان لەسەر کات و شوێنی ئەم ڕووداوە هاودەنگن و بەم شێوە شایەتییان داوە. چەندین پیت و وشە هەن کە لە یادەوەری و هەستی ئێمەدا جێ کەوتوون. ئێمە ئەم پیتانە وەك هێمای چەند ئەندێشەیەك وەبیر دەهێنینەوە، ئەم ئەندێشانەش یان لە مێشکی کەسانێکدا بووە کە ڕووداوەکەیان ڕاستەوخۆ بینیوەو ئەندێشەکانیان ڕاستەوخۆ لەوەوە دروست بووەو، یان لە شایەتیدانی کەسێکی ترەوە سەرچاوەی گرتووە و

[4]. Traite de la neture humaine, paris, Aubier, 1946 (trad. A. Leroyl), Livre I, troisieme partie, section IV, pp. 156-157.





ئەویش لە شایەتی یەکێکی ترەوە، تا ئەو شوێنەی کە سەرئەنجام دەگەینە شاهیدانی عەینیو بینەرانی رووداوەکە[5].

وا دیارە بەم ئەندێشەیە جگە لەگەڕانەوەی بێ کۆتایی (وە دواکەوتنی ناکۆتا) کە پێشتر لە بارەیەوە دواین، بەهیچ کوێیەك ناگەین، چونکە بێگومان کێشەکە ئەوەیە کە بزانین ئایا دەبێ بە(گەواهیدانی یەکسانی مێژوونوسان) قایلبین یا بەهۆی ئەوەی کە تەواوی بەڵگەکانیان ئاکامی پشت بەستنێکی بەردەوامە بەسەرچاوەیەکی هاوبەشیو لە هەمانکاتدا هەڵەیە رەتکەینەوە پرۆسەی گەڕانەوە بۆ (ئەو پیتانەی کە لە بیرەوەریو هەستی ئێمەدا جێ کەوتوون) لەگەڵ ئەو مەسەلەیەی لێرەدا جێگای باسەو، هەروەها لەگەڵ ئەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە مێژوونووسینەوە هەیە، یەکناگرنەوە.

5. CF. Egalement l'Enquete, op . cit,section X, pp. 161 - sq



## (14)

### بەڵام سەرچاوەکانی زانایی مرۆڤ چین؟

بەبڕوای ئێمە وەڵامەکەی ئەمەیە: ئەم سەرچاوانە جۆراو جۆرن بەڵام هیچ کامیان سەرچاوەی جێگای بڕوا نین.

دەکرێ بڵێین کە پێدەچێ تایمز یان ئینسایکلۆپیدیای بەریتانی سەرچاوەی زانیارین و دەکری قبوولمان بێت کە برێك لە ووتارەکانی گۆڤاری فیزیکاڵ ریڤیو[1]، لەبواری مەسەلە فیزیاییەکاندا ئیعتیبارێکی زۆرتریان هەیە، ئەگەر مەسەلەیەکی تایبەت لە ئارادابێ، دەکرێ لە تایمزو ئینسایکلۆپیدیای بەریتانی زیاتر پشتیان پێببەسترێ. بەڵام زۆر هەڵەیە ئەگەر بڵێین کە حەتمەن سەرچاوەی ووتارەکەی فیزیکاڵ ریڤیۆڵ، بینینێك(لانی کەم بەشێك لەو بینینە) بووە. سەرچاوەی ئەم گۆڤارە دەتوانێ لێکدژیەکی بەرچاو کە لە ووتارێکیتردا هەیەبخاتە روو یان پیشانیبدات کەپێدەچێ ئەو گریمانەیەی لە راپۆرتێکی دیکەدا پێشنیار

1. Physical Review





کراوه، له ڕێگای ئەزموونەوە تاقیبکرێتەوە. ئەم دۆزینەوە هەمەچەشنانەش ، کە هیچ پەیوەندییەکیان بە بینینەوە نیە، بەو واتایەی کە کارئاسانی دەکەن بۆ بەرزکردنەوەی زانایمان، ئەوا: (سەرچاوە گەلێك)یش پێکدەهێنن. بێگومان ڕەخنەیەکم لەوە نییە کە ئەزموونیش دەتوانێ، تەنانەت تاڕادەیەکی زۆر جێگای ستایشیشن، زانایی ئێمە، بەرز بکاتەوە، بەڵام بەهیچ شێوەیەك بە دوایین سەرچاوە ناژمێردرێ" دەبێ هەمیشە ئەنجامە ئەزموونیەکان تاقی بکرێنەوە: وەك باوە ئێمە لێپرسینەوە لە شاهیدی عەینی ئەزمونگەلێکی، وەك مەسەلەی هەواڵی گۆڤاری تایمز، ناکەین، بە پێچەوانەوە، ئەگەر ئەنجامی ئەزمونێکمان بردە ژێر پرسیار، دەکرێ ئەو ئەزموونە دووپات بکەینەوە، یاخود داوا لە کەسێکی دیکە بکەین ئەم کارە بکات.

سەرەکیترین هەڵەی تیۆری دوایین سەرچاوەی ئەبستمۆلۆژی ئەوەیە کە بەرۆشنی جیاوازی لە نێوان ئەو مەسەلانەی پەیوەندیان بە بنەماو سەرچاوەوە هەیەو ئەو مەسەلانەی  پیوەندییان بە ئیعتیباری کێشەکانەوە هەیە،



دانانێ. ڕەنگە لە مێژوونووسیدا هەردووکی ئەم مەسەلانە ئاوێتە بکرێن. هەندێك جار دۆزینەوەی بنچینەی بڕێك لەسەرچاوەکان، ئامرازی سەرەکی یان تەنیا ئامراز بۆ هەڵسەنگاندنی ئیعتباری بابەتێکی مێژووییە بەڵام ئەم دوو مەسەلەیە وەك یەك نین و ئێمە بەدیاری کردنی سەرچاوەکان یان بنەماو سەرچاوەی پڕوپاگەندەیەك یان هەواڵێك ئیعتیباری نادەینێ، بەڵکو بەشێوەیەکی دروستتر واتە بە تاقیکردنەوەیەکی ڕەخنە ئامێز ناوەڕۆکی پڕوپاگەندە یان- ڕاستیە بابەتەکان- هەڵدەسەنگێنن.

بەم پێیە پرسیارە ئەزمونگەراییەکانی((لەکوێ ئەزانی؟ سەرچاوەی هەواڵەکەی تۆ چییە؟)) پرسیارگەلێکی ناراستن، مەسەلەکە ئەوە نییە بێ ووردبوونەوە یان خەمساردانە داڕێژراون، بەڵکو بنەماکەی جێگای پەسەند نیە، چونکە لە ڕاستیدا وەڵامگەلێکی دەسەڵاتخوازانەی گەرەکە.





## (15)

دەکرێ پێکهاتە ئەبستمۆلۆژیە کلاسیکیەکان بە بەرهەمی ئەو وەڵامە ئەرێو نەرێیانە بزانرێ کە لەپەیوەند بە پرسیارەکانی سەرچاوەکانی ناسین دراونەتەوە، کە ئەوان پەسەندی دەکەن. ئەم پێکهاتانە هەرگیز رەخنە لە خودی ئەم پرسیارانە ناگرن و لە رەوایی ئەوان ناکۆڵنەوە: ئەو پرسیارانە زۆر بە ئاسایی دەزانن و هیچ هەڵەیەك ناخەنە ئەستۆی ئەوان.

لەبەر ئەوەی ئەم پرسیارانە بە ئاشکرا بنەمای دەسەڵاتخوازانەیان هەیە، جێی خۆیەتی لەم لایەنەوە بەووردی سەرنجیان بدرێتێ. ئەم پرسیارانە لەگەڵ مەسەلەی(کێ دەبێ دەسەڵاتی بەدەستەوە بێت؟) کە لە تیۆرە سیاسیەکاندا باسی لێوەدەکرێ، وەك یەکن. ئەو پرسیارەی دوایی، چەندین وەڵامی دەسەڵاتخوازانەی وەك (باشترینەکان) (ژیرەکان)، (خەڵك)، یان (زۆرینە) دەخوازێ}ئەو کات هەر ئەم پرسیارانە، چەندین وتەی



گەمژانەی وەك ((دەبێ دەسەڵات لە دەستی کێدابێ: سەرمایەدارەکان یان کرێکارەکان؟)) دێنێتە ئاراوە کە لەم بوارەدا لەگەڵ پرسیاری ((دوایین سەرچاوەی ناسین کامەیە؟ شعوور یان هەستەکان؟)) وەك یەکن{. ئەم پرسیارە کۆنە سیاسیە بەراست و دروست دانەرێژراوەو چەندین وەڵام هەڵدەگرێ کەدژ بەیەکن. (هەر بەو شێوەی کە لە بەشی حەوتەمی کتێبی کۆمەڵگای کراوەدا هەوڵمداوە پیشانی بدەم.) دەبێ لە جیاتی ئەوە پرسیارێکی تەواو جیاواز دابنێین: (دەبێ دامەزراوە سیاسیەکان چۆن، رێکخرێن تا ئەوەندەی دەکرێ کارە زیانبەخشەکانی رێبەرە خراپ یان نەشیاوەکان، کەمبێتەوە، ئەو کارانەی کە دەبێ خۆیان لێ دوورخەینەوە، هەرچەند بتوانین لە بەرامبەریشیاندا خۆڕا گرین((تەحەمولیشیان بکەین)) بەبڕوای من تەنیا بەگۆڕینی مەسەلەکە بەم شێوازە دەکرێ هیواداربین کە بەرەو تیۆرەیەکی ئەقڵانی دەربارەی دامەزاروە سیاسیەکان دەچینە پێشێ.





سەبارەت بە سەرچاوەکانی ناسینیش دەکرێ ئاڵۆ
گۆڕێکی لەو چەشنە پێکبهێنرێ. لە راستیدا هەمیشە
پرسیار بەم جۆرە بووە: ((باشترین سەرچاوەکانی ناسین
کامانەن بڕواپێکراوترین سەرچاوەکان ئەو سەرچاوانەی
تووشی هەڵەمان ناکەن و، ئەگەر تووشی شك و گومان بووین
دەتوانین و دەبێ لە دووایین ساتدا دەستمان پێیان را بگات،
کامانەن؟)) بەڵام بە پێچەوانەوە من لەو بڕوایەدام کە
سەرچاوە گەلێکی ئاوا تەواو دڵخواز بوونی نیە- وەك چۆن
حکوومەتە تەواو دڵخوازەکانیش بوونیان نیە- و پێدەچێ
هەندێك جار سەر لەبەری سەرچاوەکان تووشی هەڵەمان
بکەن. دەرئەنجام لەو بڕوایەدام کە دەبێ لە جیاتی
مەسەلەی سەرچاوەکانی ناسین، مەسەلەیەکی تەواو جیاواز
دابنرێ. بەم جۆرە: (چۆن دەتوانین هەڵە
بدۆزینەوە،و(چارەسەری کەین)؟.

پرسیار سەبارەت بە سەرچاوەکانی ناسیین، وەکوو
زۆربەی پرسیارەکانی دیکە کە ئیلهامگرتوون لە
دەسەڵاتخوازی، لەراستیدا لە وتەزاکانی



ڕەچەڵەکناسییە،گەڕان بەدوای سەرچاوەکانی زانایی
بەپاڵپشتی ئەو باوەڕەوەیە کە ڕەوایی ناسین پەیوەندی بە
ڕەگ و ریشەکەیەوە هەیە،پەیوەندی بە زانایی
ئەرستۆکراتێکی حەڵاڵ زادەوە هەیە،پەیوەندی بە ناسینێکی
بێخەوشەوە هەیە کە لە مەزنترین سەرچاوەی دەسەڵاتەوە
،تەنانەت گەر بگونجێ لە خواوە سەرچاوە بگرێ.: ئەمانەن
روخسارە سەروو سروشتیەکان (و زۆرتر لاشعووری) کە
بنەمای پرسیارەکە پێکدەهێنن. پێشنیاری ئێمە لەسەر
ئەوەی کە: ((چۆن دەکرێ هیوامان بە دۆزینەوەی هەڵە
هەبێت؟)) لەو ئەندێشەیەوە هاتووە کە هیچ سەرچاوەیەکی
یەکلاکەرەوەو پاك و بێگەرد بوونی نیەو، نابێ ئەو
مەسەلانەی پەیوەندییان بە بنەماو سەرچاوە یان پاکی زاتی
یەوە هەیە لەگەڵ ئەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە بەهاو
ئیعتیبارەوە هەیە لێتێکبچێ. ئەم تیۆرە زۆر کۆنەو
مێژووکەی دەگەڕێتەوە بۆ لای گەزەنفۆن. گەزەنفۆن دەیزانی
کە زانین (ناسین)، گومانێکە، بڕوایە - بڕوادار بوونە نەك
زانین - و ئەم شیعرانەی ئەو دەربڕی ئەم ڕوانینە.





خواكان یەكجێ هەمووشتێكیان بۆ ئاشكرا نەكردووین،
ئێمە دەتوانین، بە گەڕان و پشكنین، بەرە بەرە فێربین
و زانیاریەكی باشترمان لەسەر هەمووشتەكان هەبێ
بەلاّم كەس حەقیقەتی رەهای نەزانیوە
و هەرگیز نایزانێ، نەحەقیقەتی خواكان،
تەنانەت حەقیقەتی ئەوشتانەش كەمن قسەیان لێوەدەكەم
و ئەگەر بەرێكەوت كەسێك باسی دووایین حەقیقەت كات، خۆی
پەی پێ نابات

چونكە ئەو هەمووە جیا لەفۆڕمێكی تێكەلاّوی گریمانەكان شتێكی دیكە نیە. كەواتە، ئەمڕۆ سەرلەنوێ پرسیارە دێرینەكەی سەرچاوەكانی ناسینێكی جێ بڕوا، هاتۆتەوە گۆڕێ و، ئەمە زۆر تر كاری(پۆزیتڤستەكان) یان ئەو بیرمەندانەی ترە كە بە گومانی خۆیان لە دژی دەسەلاّت ڕاساون.

بەبڕوای من وەلاّمی راستی ئەم پرسیارە (چۆن دەتوانین هیوامان بە دۆزینەوەو چارەسەری هەڵەكان هەبێ؟) ئەمەیە: (بەدانە بەر ڕەخنەی تیۆریەكان یان گریمانەكانی خەڵكی



ترو- ئەگەر ئێمە خۆشمان هەمانبێ- بەدانە بەر ڕەخنەی تیۆرەكان یان گریمانەكانی خۆمان) (كاری دووهەمیان زۆر باشە بەلاّم وانیە توانای دەربازبوون لێینەبێ چونكە ئەگەر ئێمە نەتوانین رەخنە لە ڕوانینەكانی خۆمان بگرین كەسانێكی تر هەن كە لە جیاتی ئێمە ئەم كارە بكەن.) ئەم وەلاّمە دەربڕی پوختەی ئەو ڕوانگەیەیە كە من پێشنیار دەكەم ناوی (ئەقلّگەرایی ڕەخنەئامێزی) لێبنێین. ئەوە تێگەیشتنێكە، ڕەوشتێكەو، نەریتێكە كە ئێمە لە یۆنانیەكانەوە بەمیرات بۆمانماوەتەوە، ئەم روانگەیە لەگەڵ(ئەقلّگەرایی) یان (ئەقلاّنیەتی)ی دیكارت و قوتابخانەكەیو، تەنانەت لەگەڵ تیۆری مەعریفی كانتیشدا جیاوازی زۆرە. هەڵبەت كانت لەبواری ئاكاردا، لە ئەبستمۆلۆژی ئەخلاقدا، بەهۆی بنەمای خودموختاری یان خۆ بڕیاردانی مرۆڤ لێی نیزك بۆتەوەو لەوە تێگەیشتووە كە نابێ لە سەر بنەمای گوێڕایەڵی بۆ فرمانەكانی سەرچاوەیەكی دەسەلاّت، هەر چەند ێك ئەو سەرچاوەیە مەزنیش بێت، ئەخلاق، دروست كرێ. كەواتە هەركات لەهەر





بارودۆخێکدا، سەرچاوەی دەسەڵات فرمانێکی بە ئێمەدا لە سەرمانە بە شێوازی رەخنەییانەی خۆمان، لە ئەخلاقی بوونی ئەو فرمانە بکۆڵێنەوە، رەنگە سەرچاوەی دەسەڵات توانای ئەوەی هەبێ فرمانەکانی خۆی بەڕێوەبەرێ، رەنگیشە ئێمە نەتوانین بەرەو رووی بوەستینەوە بەڵام ئەگەر بە کردەوە توانای هەڵبژاردنمان هەبێ دوایین بەرپرسیاریەتی هەر هەڵبژاردنێك کە ئەنجامیدەدەین لە ئەستۆی خۆمانە. ئەرکی سەرشانمانە بە شێوەیەکی رەخنەئامێز بڕیاربدەین کە ئایا دەبێ پێڕەوی لە فرمانێك بکەین، ئایا دەبێ گوێڕایەڵی سەرچاوەیەکی دەسەڵات بین؟

کانت زۆر بوێرانە ئەم ئەندێشەیە دەکێشێتە چوارچێوەی ئایینیشەوە و دەڵێ: [ ...]هەر کەسێك، بە هەر شێوەیەك، بوونەوەرێك وەك خوا بناسێنێ و دیاری بکات و، بەهەر شێوەیەك ئەو بوونەوەرەی بۆ دەر کەوتبێ [...]دەبێ خۆی بڕیار بدات کە ئایا مافی سەرلەنوێ ناسینەوە



(لێتێگەیشتنەوە)ی (ئەو دەرکەوتنە)و ستایش کردنی ئەو شتەی وەك خوا هەیە؟[1])).

سەیرە، کانت بە بوونی ڕوانگەیەکی بوێرانەی لەو چەشنە، لە فەلسەفەی تێگەیشتنی زانستیانەی خۆیدا ئەم شێوازە واتە شێوازی ئەقڵگەرایی رەخنەی ئامێزیو دۆزینەوەی هەڵە لەرێگای رەخنەوەی نەگرتۆتەبەر. من لەوە دڵنیام کە تەنیا وەرگرتنی ئیعتباری گەردووناسی نیوتن[2] ئەو ئیعتباری لەو سەرکەوتنە تاڕادەیەك بڕوانەکراوەی ئەو گریمانەیە لە تەحەموولکردنی ووردترین تاقیکردنەوەکانەوە سەرچاوەی گرتبوو– نەیهێشتووە کە کانت لەوێش شێوەیەکی لەو چەشنە هەڵبژێرێ. ئەگەر ئەم خوێندنەوە یە بۆ فەلسەفەی کانت دروست بێت ئەقڵگەرایی رەخنەگرانە(تەنانەت ئەزموونگەرایی ڕەخنەگرانەش) کە من

---

[1] E. Kant ,Ie Religion dans les Limites de la simple raison ,quatrieme partie, deuxieme section, e l. note 1 (ajoutee la seconde edition de 1974).

[2] Isaac newton (1642 – 1727) فیزیازان و ماتماتیکزانی ئینگلیزی، وەرگێڕی فارسی.





لایەنگریم، جیا لە کاملّکردنی تیۆریە رەخنەییەکەی کانت شتێکی دیکە نابێ. ئەنشتاین[3] ئەم کارەی مسۆگەر کردو سەلماندی کە گریمانەی نیوتن سەرەڕای سەرکەوتنە مەزنەکەی، زۆر وێدەچێ هەڵەبێ.

سەر ئەنجام من بەم شێوەیە وەڵامی پرسیارەکانی(ئەمە لە کوێ دەزانی؟ سەرچاوە یان بنەمای ئیدعاکەی ئێوە چیە؟ چ روانین(بینین)گەلێك ئێوەی گەیاندۆتە ئێرە؟ دەدەمەوە:((نازانم. ئەم ئیدیعایە تەنیا گریمانێکی سادەو رووت نیە. ئەو سەرچاوە یان سەرچاوانەی کە ئەویان پێکهێناوە، چەندین سەرچاوەی گوماناویو زۆروزەوەندن و تەواو پێدەچی کە تەنانەت من نیوەشیانم بەبیردا نەهاتبێ. بە پێچەوانەوە ئەگەر ئێوە حەزتان بەو مەسەلەیەیە کە من هەوڵمداوە رێگا چارەیەکی بۆ بدۆزمەوە ئەوا دەتوانن بە رەخنەگرتنێك توندتریش بێت لە کارەکەی من، درێژە بە

[3] Albert einstein (1879 – 1955) فیزیازانی ئەڵمانی بەرەچەڵە ئەمریکی، وەرگێڕی فارسی.



کارەکە بدەن. ئەگەر توانیتان بگەن بە تاقیکردنەوەیەکی رەخنەگرانە کە بە بڕوای ئێوە، بتوانێ روانگەکەی من رەتبکاتەوە، ئەوا بەو پەڕی حەزوو بەهەمموو تواناوە بەشداری ئەو کارە دەکەم کە بۆ رەتکردنەوەی روانگەکەم ئەنجام دەدرێ)).

بەهیچ شێوەیەك ئەم وەڵامە[4] جیا لە ڕوانگە زانستیەکان ناتوانرێ بەواتای دژ بە ڕوانگەی مێژوویی بەکاربهێنرێ ئەگەر گریمانەی من لە جۆری مێژووی بوایە، سەرچاوەکان دیارە نەك بەواتای دوایین سەرچاوە) ئاشکرایە کە لە تاقیکردنەوەی ڕەخنەگرانەی ئیعتباری ئەودا رۆڵێکی دەبوو. بەڵام هەر وەك پێشتر ووتم بنەمای وەڵامەکەی من هەر ئەمەیە.

[4] ئەم وەڵامەو تاڕادەیەك تەواوی بەشی 15 بە چەند دەستکارییەکی کەمەوە لە ووتارێکەوە وەرگیراوە کە بەرلە ئێستا لە گۆڤاری: Indian I,n,195: Journal of philosophy: چاپکراوە.





## (16)

ئێستا ئیتر کاتی ئەوە هاتووە ئەنجامگیریەکانی ئەبستمۆلۆژیی توێژینەوەیی و لێکۆڵینەوەیی خۆمان ڕێزبەندی بکەین. من ئەم ئەنجامگیریانە بەشێوەی زنجیرەیەك لەسەر بنەمای(تێز) نیشان دەدەم:

1–دوایین سەرچاوەی ناسین بوونی نیە. نابێ هیچ سەرچاوەیەك، هیچ هێمایەك پشتگوێ خەین و، دەبێ تەواوی ئەوانە تاقیکرێنەوە. تەنیا لە بواری مێژوویيدا نەبێ، ئێمە بە گشتی ڕاستیەکان تاقی دەکەینەوە نەك سەرچاوە هەواڵگرییەکانی ئەو ڕاستیە.

2–نابێ پرسیاری دروستی ئەبستمۆلۆژی لەمەڕ سەرچاوەکان بێت، بە پێچەوانەوە دەبێ بپرسین ئەوەی کە بانگەشەی بۆ دەکرێ ڕاستە، ئایا لەگەڵ ڕاستیەکاندا دێتەوە(کارەکانی تارسکی[1] ئەوەیان دەرخست کە دەکرێ بیرلە حەقیقەتی بابەتی واتە بوونی پەیوەندی لەگەڵ

[1] Alfred Tarski (1902 – 1983) لۆژیکناسی ئەمریکایی بەرەچەڵەك پۆڵۆنی، وەرگێڕی فارسی.



ڕاستیەکاندا بکەینەوەو تووشی لێکدژی ووتن نەبین). ئەو کات تێدەکۆشین هەتا بە باشترین شێوە کە دەتوانین، بەهەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوەی ڕاستەوخۆ، یان لە ڕێگای هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوەی ئەنجامگیریەکانەوە، ئەوەی کە بانگەشەی بۆ دەکرێ، چارەسەر بکەین.

3–زۆر کار هەن کە دەکرێ شیاوی ئەم جۆرە تاقیکردنەوەیە بن. یەکێك لە پرۆسە تایبەتیەکانی ئەم توێژینەوەیە ئەوەیە کە بزانین ڕوانگەکانمان لەگەڵ بینینەکانمان دێنەوە. بەڵام هەروەها دەکرێ، بۆ وێنە، هاوئاهەنگی دەروونی و کۆکی سەرچاوە جۆراو جۆرە مێژووییەکانیش تاقیبکرێنەوە.

4–ئەگەر ناسینی فیتری(زگماکی) بخەینە لاوە روونو ئاشکرایە کەنەریت(سونەت)، چ لەڕوی چەندایەتیو چ لەڕوی چۆنایەتیەوە گرنگترین سەرچاوەی زانایی ئێمەیە. ئێمە، زۆربەی ئەو شتانەی دەیزانین، لە ڕێگای پەیوەندیەکان، خوێندنەوەی کتێبەکان و، هەروەها





بەفێربوونی رەخنەگرتن، بە تەحەموول و قبوولکردنی رەخنەو ، بەڕێزدانان بۆ حەقیقەت، فێری بووین.

5-لەبەر ئەوەی نەریت(سونەت) بنەمای زۆربەی سەرچاوەکانی ناسینی(تێگەیشتن) ئێمەیە کەواتە دەبێ دژە نەریتخوازی وەك روانگەیەکی بێبەرهەم(ناکارا) بەڕەتکراوە بزانین، بەلاّم ناتوانین ئەمە بە بەلّگەی پشتیوانیکردن لە نەریتخوازی بزانین. هەر بەشێك لە زانایی سەرچاوەگرتوو لە نەریت(تەنانەت ناسینە فیترییەکانیشماندا) پێویستی بە تاقیکردنەوەیەکی رەخنەیی هەیەو پێشدەچێ کە ڕاست نەبێ. لەگەلّ ئەوەشدا، مەحالّە بەبێ نەریت، ناسین مسۆگەر بێت.

6-ناکرێ لە هیچەوە - لە لاپەڕەی سپییەوە[2]-ناسین دەست پێ بکرێ، یان هەر تەنیا بە پشکنین قەناعەت بکەین. پێشکەوتنەکانی زانایی لە بنەڕەتەوە گۆڕانی شکلّی زانایییەکانی پێشووە. ئەگەر چی هەندێك جار ئەم

[2] Tabula rasa



پێشکەوتنانە، بۆ وێنە لە شوێنەوارناسیدا، بەرهەمی بینینێکی بەڕێکەوتە بەلاّم لەڕوی چۆنایەتییەوە بایەخی هەر دۆزینەوەیەك لەو توانایەدایە کە بۆ چاکسازی ڕوانگەکانی پێشووی ئێمە هەیەتی.

7-لە تیۆری ناسیندا(ئەبستمۆلۆژیا) ڕوانگە گەشبین و ڕەشبینەکان وەك یەك هەلّەن. چیرۆکی ئەشکەوتەکەی ئەفلاتوون راستە، نەك روانگەی گەشبینانەی وەبیر هێنانەوە(هەرچەند دەبێ ئەوەمان قبولّ بێت کە هەر مرۆڤێك، وەك تەواوی ئاژەلّەکان و تەنانەت گژوگیاکانیش، زانایییەکی فیترییان هەیە)، گەرچی دنیای شتە دیارەکان لە سێبەری سەر دیواری ئەشکەوتەکان دروستبووە، بەلاّم بەردەوام هەمووومان دەمانەوێ لەوان واوەتر بڕۆین. تەنانەت، وەك دیمۆکرێت[3] دەلّێ: ئەگەر حەقیقەت لە قوولاّیی ئەشکەوتێکدا حەشار درابێ ئێمە دەتوانین ئەو ئەشکەوتەش بگەڕێین و بیپشکنین. ئێمە بۆ حەقیقەت پێوانەیەکمان نیە،

[3] DK B 117.(یاداشتی وەرگێڕی فەرەنسی)





ئەمەش تووشی ڕەشبینیمان دەکات، بەڵام پێوانەی زۆرو زەوەندمان هەیە کە، ئەگەر بەخت یاوەرمان بێت، دەتوانن ئەو بوارەمان بدەنێ کە سەرلەنوێ هەڵەو ناڕاستی بناسینەوە. پێوانەکانی حەقیقەت، ڕۆشن و ئاشکرایی نین، بەڵام پێدەچی تایبەتمەندیگەلێکی وەك ناڕۆشنیو لێڵی، هێمای هەڵەبن. هەروەها هاوئاهەنگی ناتوانێ حەقیقەت بسەلمێنێ بەڵام ناهاوئاهەنگییەکان زۆر بەباشی سازگارنەبوونی ناڕاستی دەسەلمێنن. هەڵەکانمان، ئەو کاتەی کە پێمان زانین، دەبنە ئەو ڕووناکیە کزانەی کە یارمەتیمان دەدەن هەتا بەرە بەرە خۆ لە تاریکایی ئەشکەوتەکە ڕزگار کەین.

8-نە بینین خاوەن ئیعتبارێکی ڕەهایەو نەبەڵگە هێنانەوە. پشکنین و خەیاڵ هەردووکیان ڕۆڵی یەکلاکەرەوەیان لە ئەستۆیە، بەڵام ناکرێ تەنیا قەناعەت بەوانە بکەین: ئەمانە دەتوانن زۆر ڕوون و ئاشکرا چەندین شتمان بۆ دەرخەن بەڵام لەهەمان کاتیشدا دەتوانن تووشی هەڵەشمان بکەن، ناتوانین لەبەر چاویان نەگرین چونکە



سەرچاوەی سەرەکی گریمانەکانی ئێمەن بەڵام هەر چۆنێك بێت زۆربەیان ناڕاستن. ئامانجی سەرەکی بینین و بەڵگەداریو، تەنانەت خەیاڵ و پشکنینیش، بەشدارییە لە دانە بەر ڕەخنەی ئەو گریمانە ڕێکەوتیانەی کە بەیارمەتیی ئەوان لەنەزانراوەکان دەکۆڵینەوە.

9-ئەگەر ڕۆشنی لە خۆوە بایەخدارە، ئەوا وورد بوونەوەو تێ ڕامان حوکمێکی دیکەی هەیە: پێویست ناکات زۆرتر لەوەی کەمەسەلەیەك پێویست دەکات وە دوای ڕۆشنی بکەوین. لە زمان(گوفتار)دا ڕۆشنی، لە خەیاڵێك زیاتر نیە. ئەو مەسەلانەی کە سەروکاریان لەگەڵ واتایان پێناسە کردنی وشەکاندا هەیە، کەم بایەخن. بەم جۆرە خشتەی ئەندێشەکان(کە لەلاپەڕەی 59 هاتووە) هەرچەند ئاوێتەکردنێکی پەیوەندیداریان هەیە، لە یەکێك لە ستوونەکاندا توخمگەلێك پیشاندەدات کە بایەخیان هەیە، لە ستوونی دوو هەمدا ئەو توخمانە پیشاندەدا کە بێ بایەخن: ستوونی لای چەپ(ستوونی ووشەکانو مانای وشەکان) بێ کەڵکە، ستوونی لای ڕاست(کە تیایدا ڕوانگەکان و مەسەلە





پەیوەندیدارەکان بە حەقیقەتەوە، دەبیندرێن) بایەخێکی لە ڕادەبەری هەیە. وشەکانی تەنیا وەك ئامرازێك بۆ شێوە پێدانی تیۆرەکان جێگای سەرنجن و دەبێ بەهەر نرخێك بێت خۆمان لەو پرسیارانە بدزینەوە کە جگە لە شەڕی وشەکان(واتە جگە لە دەمەقاڵە) شتێکی دیکە نین.

10–ڕێگا چارەی هەر مەسەلەیەك، خۆی دەبێتە هۆی دروستبوونی چەندین مەسەلەی نوێ، کە دەبێ ئەوانیش چارەسەربکرێن. بایەخی مەسەلەیەك پیوەندی بە یەکەم کێشەو بوێرانەبوونی ڕێگا چارە پێشنیارکراوەکەوە نیە. هەرچی زیاتر سەبارەت بە جیهان شت فێربین ، هەرچی ئەم فێربوونانەش قوڵتر بن هۆشیاری ئێمە لەو شتانەی کە نایزانین، تێگەیشتن لە نەزانی ئێمە زیاتر دەبێ و ووردبوونەوەو ڕۆشنیەکی زۆرتر بەخۆوە دەگرێ. لە ڕاستیدا سەرچاوەی گەورەی نەزانی ئێمە لەوەوە یە کە بە دڵنیاییەوە تێگەیشتنی کۆتاییەکی هەیەو لە کاتێکدا کە بەپێی جەبر نەزانی ئێمە سنوری نیە



ئێمە کاتێك پەی بە پانتایی ڕووبەری نەزانی خۆمان دەبەین کە دەڕوانینە پانتایی لەبننەهاتووی ئاسمانەکان: ئەگەر ئەم ڕاستیە سادەیەی لایەنەکانی جیهان تاکە هۆکاری نەزانی مرۆڤ نەبێ لانی کەم یەکێك لە هۆکارەکانیەتی. ڕامسی لە بەشێکی[4] سەرنجڕاکێشی کتێبی بنەمای ماتماتیکدا دەنووسێ: (لە بوارێکدا من وەك برادەرەکانم بیرناکەمەوە ئەویش ئەوەی کە لایەنە فیزیاییەکانی هیچ شتێك کاریگەریەکی ئەو تۆیان لەسەر من نیە. بەربڵاوی ئاسمانەکان هیچ هەستێکی سووکێتیم تیا پێکناهێنن. بە دڵنیاییەوە ئەستێرەکان گەورەن بەڵام نەدەتوانن بیر بکەنەوەو نەدەشتوانن سۆزبگۆڕنەوە، لە کاتێکدا ئەم تایبەتمەندیانە لەڕەهایی لایەنەکان زۆرتر کارم تێدەکەن. من

[4] F. P. Ramsey (1852 – 1916)، کیمیازانی ئینگلیزی، وەرگێڕی فارسی.





هیچ شانازییەك بە كێشی 105 كیلۆی خۆمەوە ناكەم[5])). من پێم وایە دۆستەكانی ڕامسیش سەرنجی گاڵتەجاڕ بوونی لایەنە فیزیاییەكانیان داوە. لەگەڵ ئەو بیركردنەوەشدام كە ئەگەر ئەوان لە ئاست بێ كۆتایی بوونی ئاسمانەكاندا هەستیان بە سووكایەتی كردووە لەبەر ئەوە بووە كە ئەویان بە دەربڕی نەزانی خۆیان زانیوە.

من لەو بڕوایەدام كە تەنانەت ئەگەر ئێمە لەو ڕێگایەوە بێجگە لە پانتایی بچكۆلەی زانایی خۆمان، شتێك فێر نەبین ڕەوایە كە بۆ گەیشتن بە ناسینی جیهان تێبكۆشین. ئەم نەزانییە بیرمەندانەییە دەتوانێ گەلێك كێشەمان لەكۆڵ كاتەوە. جێی خۆیەتی ئەوەمان لە بیر بێت كە ئەگەر چەندین زانایی (زانیاری) بچكۆڵەی جۆراو جۆر ئێمە زۆر لە یەكتر جیاوازدەكا بەڵام هەموومان لە نەزانی بێ كۆتایی خۆماندا یەكسانین.

5. F. P. Ramsey, The Foundations of mathematics and other Logical Essays, Iondres ,Kegan Paul ,1931 ,P. 291.



## (17)

خاڵێكی دیكە هەیە كە حەزدەكەم تاووتوێی بكەم.

كاتێك بە ناچاری تیۆرێكی فەلسەفی، بەهۆی ناڕاستبوونیەوە، وەلاوە دەنێین، هەندێك جار وا ڕێدەكەوێ كە، ئەگەر وەك پێویست ووردبیینەوە ئەندێشەیەكی ڕاستی تێدا دەبینینەوە، كەشایانی پاراستنە. ئایا دەكرێ لە ڕوانگە سەلمێنەرەكانی بوونی دوایین سەرچاوەی ناسینیشدا بەتێگەیشتنێكی لەو چەشنە بگەین.

وا دیارە بەو شێوەیەیە. ئەوەش بڵێم كە ئەو تێگەیشتنە، یەكێك لەو دوو تێگەیشتنە سەرەكییەیە كە لەگەڵ قبوڵكرنی تایبەتمەندی سەروسروشتی بوونی سەرچاوەكانی ناسین یەك دەگرێتەوە، بەبڕوای من یەكەمین تێگەیشتن (لەم تێگەیشتنە) ناڕاستەو دووەم تێگەیشتن ڕاستە.

ئەم بۆچوونە هەڵەیەكە دەبێ ئێمە تێگەیشتوویی یان ڕوانگەكانی خۆمان بە چەندین بەڵگەی ئیجابی(باش)، واتە ئەو بەڵگانەی كە بتوانن سەلمێنەری ڕوانگەكان بن یان لانی





کەم، ئەگەری راستبوونی ئەوان بەرزکەنەوەو، هەرچۆنێك بێ بەچەندین بەڵگەی باشتر لەو بەڵگەیەی کە تا ئێستا تیۆرەکان توانای تەحەمووڵی رەخنەکانیان نەبووە، پاساوبدەین. بەبڕوای من ئەم ئەندێشەیە دەبێتەهۆی دەستبردن بۆ دووایین سەرچاوە، بۆ ناسینی حەقیقەت یان دەست بە دامێنی سەرچاوەیەك دەبێ کە وەك ئیدیعادەکرێ لەم بوارەدا جێی بڕوایە ، تەنانەت بە بێ ئەوەی پێناسەیەك بۆ ناوەرۆکی ئەو سەرچاوەیە — کە ڕەنگە مرۆیی بێ، وەك بینین یان ئەقڵ،و، یان سەرو مرۆیی (سەروسروشتی)یە کرابێ.

ئەندێشەی دووهەم– کە ڕاسڵ گرنگی یەکلاکەرەوەی ئەوی پیشانداوە– ئەوەیە کە هیچ دەسەڵاتێکی مرۆیی ناتوانێ بە فرمان (بڕیار)، حەقیقەتێك دروست بکات. ئێمە دەبێ لایەنگری حەقیقەت بین، لەبەر ئەوەی مەزنی بە دەسەڵاتی مرۆڤ دەبەخشێ.ئەم دوو بۆچوونە پێکەوە ئێمە هان ئەدەن، بۆ ئەم ئەندێشەیەی– ئەنجام کت و پڕە– کە بەناچاری سەرچاوەکانی ناسینی ئێمە سەرو مرۆیین، بەڵام



ئەم روانگەیە شیاوی فێڵبازی و ئەنگیزەیەکە بۆ کەڵك وەرگرتنی زوڵم و زۆر بە دژی ئەو کەسانەی کە جەختکارانە روو لە ناسینی خوایی حەقیقەت وەردەگێڕن.

بەداخەوە تاقمێك کە بە راستی دژی ئەنجامگیریگەلێکی لەو چەشنەن، فکری یەکەم بڕوا بوون بەوەی کە بە دوایین سەرچاوە بۆ ناسین هەیە بەناراست نازانن، بەپێچەوانەوە ئەندێشەی دووهەم واتە ئەو ئەندێشەیەی کە حەقیقەت، دەسەڵاتی مرۆڤ بەرزدەکاتەوە، ڕەتدەکەنەوە بەمجۆرە ئەندێشەی تایبەتمەندی عەینی (بەرچاوی) ناسین و بوونی چەندین پێوانەی هاوبەش و گشتی رەخنەیی و عەقڵانی بەناراست دەژمێرن.

بەبڕوای من رەوایە واز لە ئەندێشەی دوایین سەرچاوەی تێگەیشتن بێنین و ئەوە قبوڵکەین کە تێگەیشتن سەر لەبەری شتێکی مرۆییەو لەگەڵ هەڵەکانمان، حوکمدانە پێشوەختەکانمان، خەون و ئاواتەکانمان، ئاوێتەو تەنیا ئەوەمان لە دەست دێت کە تاگەیشتن بە حەقیقەت، لە





تێکۆشان نەوەستین، دەکرێ ئەوە قبوڵ بکەین کە زۆرجار ئەم هەوڵانە لە ئیلهامیش بەهرەمەندن بەڵام دەبێ ڕەشبین بین بەو بڕوایەی ــ بەهەر ڕادەیەك ڕاستەقینەش ــکە بە بایەخی خوایی یان ناخوایی ئیلهام هەیە. ئەگەر بەم جۆرە تێگەیشتین کە لەسەرانسەری پانتایی ناسین، تا دوورترین شوێن کە ناسین دەتوانێ لە نەزانراوەکاندا بچێتە پێش هیچ دەسەڵاتێك نیە کە ڕەخنە هەڵنەگرێ، ئەو کات دەتوانین، بەدوور لە مەترسی، ئەم بیرۆکەیە وەربگرین کە حەقیقەت، مەزنی دەبەخشێ بە دەسەڵاتی مرۆڤ و ئەمەش پێویستیەکە چونکە، ئەگەر بەم شێوەیە بیرنەکەینەوە نە یاساو ڕێکخەرە بابەتیەکانی لێکۆڵینەوە، نەرەخنەگرتن لە گریمانەکان، نەهەوڵدان بۆ دۆزینەوەی نەزانراوەکان، نە گەڕان بە دوای زاناییدا هیچ کامیان بوونیان نابێ.

## زنجیرەی بڵاوکراوەکان[illegible]ن لە ساڵی 2004

| ناوی کتێب | زمان | [illegible] | [illegible]ت | ساڵی دەرچوون | وەرگێڕ |
|---|---|---|---|---|---|
| ڕۆشنبیرو دەسەڵات | عەرەبی | سعدالدين ابراهيم | ڕۆشنبیری | 2004 | هەڵکەوت عەبدوڵلا |
| شانۆ لە چەند وتارێکدا | عەرەبی | عەونی کەڕومی | شانۆیی | 2004 | پەروەر نەجمەدین |
| ستراتیژیی سەربازیی | فارسی | ریچارد کاگلەر | سیاسی | 2004 | دلێر میرزا |
| نامەیەک دەربارەی | فارسی | جۆن لۆک | فەلسەفی | 2004 | شۆڕش جوانڕۆیی- |



| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| لێکبوردن | | | | | فەرشید شەریفی |
| مەولاناخلیدو تەریقەتی نەقشبەندی | فارسی | سەید طاهر هاشمی | فیکری | 2004 | دلێر میرزا |
| سێ شانۆ نامە | عەرەبی | جان کۆکتۆ ئۆین ج. ئارنۆ میشێل دی. ئۆنامۆنۆ | شانۆی | 2004 | هەورامان قانع |
| را پۆرتی برۆدی | فارسی/ عەرەبی | خۆرخە لویس بۆرخس | چیرۆك | 2004 | یاسین عومەر |
| بیرەوەرییەکانی هەڵەبجە | کوردی | بەکر حەمە صدیق | مێژووی | 2004 | بەکرحمە صدیق/ کوردی دلێرمیراز/ فارسی م. حسن عبدالکریم ئینگلیزی/ فوئاد تاهیر |
| ڕەهەندەکانی ناسیۆنالیزم | فارسی | کۆمەڵێ نووسەر | نەتەوەیی | 2004 | ئارام جمال |
| ریفراندۆم باشترین شێوازی خەباتە | سویدیی ەوە | تۆم گولبێری | سیاسی | 2004 | ئیدریس ئیبراهیم |
| شانۆی پانتۆمایم | عەرەبی | بورهان قەرەداخی | شانۆی | 2004 | بورهان قەرەداخی |
| گوڵەزەر | عەرەبی | جەنگیز ئیمتاتۆف | ڕۆمان | 2004 | جەوهەر کرماج |
| پاژنەی ئاسنین | عەرەبی | جاك لەندەن | ڕۆمان | 2004 | کەمال غەمبار |
| خەناوکەیەك بۆ سەر میناز | فارسی | ئەحمەدخان ئەبوبەکر | ڕۆمان | 2004 | ئەبوبەکر خۆشناو |
| ئەندامێکی میت | تورکی | محەمەد ئەیمور | سیاسی | 2004 | ئارام عەلی عەزیز |
| کورتترین ڕێگەی سەرکەوتن | فارسی | ڕۆبێرت ئۆریلی | دروونناسی | 2004 | سالار عەبدلرەحمان |
| کۆماری مهاباد | کوردی | عەبدوڵلا ئەحمەد ڕەسول | مێژوویی | 2004 | سەلمان عەلی |
| چوار وتاری شیشرۆن | فارسی | رحمەت الله مقدم مراغەی | فەلسەفی | 2004 | شۆڕش جوانڕۆی- کامل ئەحمەد بەگ |
| گەلەلوورانی دەشتودەر | سویدی | جاك لەندەن | چیرۆك | 2004 | حەکیم کاکە وەیس |





| جوغزە گەچینە | عەرەبی | برێخت | شانۆ | 2004 | عومەر عەلی ئەمین |
|---|---|---|---|---|---|
| نیوەکەی تری جیهان | عەرەبی | چەند نووسەرێکی بیانی | چیرۆك | 2004 | نوری سەعید قادر |
| مافەکانی ژن لەدەتپێکەوە | فارسی | نای بن سەعدون | رۆشنبیری | 2004 | کارزان محەمەد |
| بەناو ئیسلامەکان | عەرەبی | د.رەفعت ئەلسەعید | فیکری | 2004 | حەسەن عبدالکرم |





